# پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت

نووسینی : ئیڤیلین ریید

پێشەکی و گۆڕینی : حەمە کەریم عارف

کەرکووک ............... 2006





ناوی کتێب: پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت
بابەت: لێکۆڵینەوە
نووسینی : ئیڤیلین ریید
وەرگێڕ : حەمە کەریم عارف
لەبڵاوکولاکانی یەکێتی نووسەرانی کورد ـ لقی کەرکوک ژمارە ـ 67
نەخشەسازیو بەرگ: محمد مهدی
سەرپەرشتی چاپ: محەمەد سەعید زەنگنە
چاپخانە: ئارابخا ـ کەرکوک
چاپی یەکەم ـ 2006

## پێشەکییەکی پێویست

مەسەلەی چەوساندنەوەی ئافرەت لە مێژوودا لە ریزی پێشەوەی هەموو چەوساندنەوەیەکی دیدایە و رەنگە هیچ نەبێ بە زێدەرۆیی گەر بگوترێ لە رووی زەمەنییەوە بەر لە هەر چەوسانەوەیەکی دیکە هاتووە و یەکەمین چەوسانەوەیە لە مێژوودا. دیارە گەلێك هۆکار و فاکتەری کۆمەلاَیەتی و ئابووری لە سیاقی رەوتی مێژوودا دەوریان لەم بوارەدا هەبووە... ئەوەتا (رجین برنو) ئەوە ساغ دەکاتەوە کە (پایەی ئافرەت لە کۆمەلَدا بە ئەندازەی زۆر بوونی پایە و دەسەلاَتی بورژوازی کەم دەبێتەوە واتە بورژوازی کاتێ کە لە پالَ دەسەلاَتی ئابوریدا دەسەلاَتە سیاسی و کۆمەلاَیەتییەکان بۆ خۆی دابین دەکات، پایەی ئافرەت تەواو دێتە خوارەوە...

بەم پێیە وەکو چۆن یەکەمین دابەشکردنی کار لە نێوان پیاو و ژن دا بووە، یەکەم چەوسانەوەش بەر ئافرەت کەوتووە و، چەوساندنەوەی ئافرەت دەکەوێتە پێش ئەو چەوساندنەوە چینایەیتیەوە کە لەگەلَ سەرهەلَدانی کۆیلایەتیدا دەستی پێکرد، دەکەوێتە پێش ئەو چەوساندنەوە رەگەزی و



نەژادییانەوە کە لەگەلَ ئیمپریالییەتی ئەسینا و رۆمادا و پاشان لەگەلَ ئیمپریالەتی رۆژاواییدا سەریهەلَدا. ئەو چەوساندنەوەیەی کە ئەنگلز پێی وایە وێڕای بەرهەمهێنانی کۆیلایەتی و مۆلکداری تایبەتی، سەرەتای ئەو قۆناغەشە کە تا رۆژگاری ئەمڕۆ بەردەوامە و، هەر پێشکەوتنێك لەو رۆژەوە تا ئەمڕۆ، لە هەمان کاتدا هەنگاوێکی رێژەیی بووە بۆ دواوە، چونکە خوشگوزەرانی و پێشکەوتنی خەلَکانێك لەسەر حەساوی عەزاب و سەرکوتکردنی خەلَکانێکی دیکە بووە.

کەواتە کارتی ئابووری یان ئەوزاری ئابووری بەدەست هەر کەس و لایەن و چینێکەوە بێ ئەو دەبێت بە خودانی دەسەلاَتی راستەقینە و بناغەی هەموو دەسەلاَتەکان لە سیاسییەوە بیگرە تا دەگاتە رۆشنبیریی لەسەر فاکتەری ئابووری رۆدەنرێت. دیارە فاکتەری ئابووری تا رۆژگاری ئەمڕۆش لە هیچ شوێنێکی دنیادا بەدەست ئافرەت نییە، ئەگەر بەشێوەیەکی ریزپەڕ لە ولاَتێکدا، یان لە دنیادا رێژەیەکی زۆر کەمی ئافرەتی دەولَەمەند هەبێ، ئەوا لە رووی کاریگەری ئابووری و سەرمایەدارییەوە لە نرخی نەبوودایە. لە باری ئاینییەوە، تەورات و پاشتر کلێسای مەسیحی، لە کۆمەلَگەی باب سالاریدا سەریان هەلَدا و راوبۆچوونە پێشوەختەکانی ئەو کۆمەلَگەیەیان نواند و بەرجەستە کرد، هەزار و یەك بەلَگە و بیانووی غەیبانیان بۆ

پشتیوانی تێوری کێماسی ئافرەت هێناوەتەوە. خۆ بەگوێرەی بۆچوونەکانی خاتوو (بنتاسیلغو) ئافرەت لە کۆمەڵگەی جولەکەدا بەتەواوەتی لە هەموو شتێك بێ بەش بووە... و سورە لەسەر ئەوەی کە کلێسا دەوری زۆری لە بواری چەسپاندنی بونیادی نێر سالاری و باب سەروەری کۆمەڵگەدا دیتوە. خۆ لە ئاینی مەسیحیدا هەمیشە هەوڵدراوە ئەو حەقیقەتە بشاردرێتەوە کە مرۆڤایەتی لە کەماڵی خۆیدا مێ و نێرە: مێ و نێر بە جۆرێ ئاوێتەن کە لەیەکدی نایەنە جیابوونەوە... ئیدی دەیان حیکایەتیان داهێناوە کە ئافرەت تەنانەت لە دوای حەیواناتیشەوە دێت و زۆر جار پێی گوتراوە "دەرگای شەیتان" ئیدی لە سەردەمی قەدیس پولس-ەوە گلۆڵەی ئافرەت بەجارێ کەوتە لێژی و نەریت وتەقلیدێکی حاخامی زاڵمانەتر سەبارەت بە ئافرەت چەسپی و دەگوترا :" پیاو لە پێناوی ئافرەتدا نەخولقاوە، بەڵکو ژن لە پێناوی پیاودا خولقاوە" تاوەکو سەردەمی قەدیس تومای ئەکوینی کە بە قەناعەتەوە پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە "ئافرەت بە تەبیعەتی خۆی بندەستەی پیاوە، چونکە پیاو بە ئاوەزترە لە ژن." ئیدی گەلێك لەو داب و نەریت و بۆچوونانە کران بە تەوق و لە گەردنی ئافرەت خران و تا رۆژگاری ئەمڕۆش کەم و زۆر، راستەوخۆ یان نا راستەوخۆ پێوەی دەناڵێنن و ئاین هێشاش



هەر سورە لەسەر پشتیوانی کردنی کۆمەڵگەی باب سالاری کە زۆر بەزەقی مافی ئافرەتی تێدا پێشێل دەکرێ. بەهەرحاڵ کە لەگەڵ پەرەسەندنی ژیان و ئاڵۆزبوونی ژیاندا، ئایدولوجیا و ئاین هەندێ دەسەڵاتی کەم بووەوە، ئیدی پیاو لە دەریێ بازنەی ئایندا، بۆ بەڵگە دەگەڕان تا ئافرەت لە چوار دیواری ماڵەوە بهێڵێنەوە، یان شەرعیەت بە لەماڵەوەمانی ئافرەت بدەن، ئیدی پەنا وەبەر زانستە سروشتییەکان برا و ئەوە سەلمێنرا کە مێ لە چۆلەکەوە تا مەیموون پاسەوانیی هێلانە دەکات و نێر راو دەکات، بەمجۆرە پاسەوانی ماڵ ئەرکی مێ یەو دیارە ئەمە بە تێپەڕبوونی رۆژگار بووە مایەی زاڵبوونی ئابووری بازاڕ بەسەر ئابووری و بژێوی ماڵەوە، ئەمەش کردیە کارێك کە دەور و رۆڵ و پایەی ئافرەت لە هەموو ئاستێکی ژیانی کۆمەڵایەتیدا پاشەکشەبکات. ئەمە تەنیا رووداوێکی ئابووری نەبوو، بەڵکو پەلوپۆی بۆ کایە سیاسی و رۆشنبیرییەکانیش هاویشت وئیدی جۆرە دابرانێك کەوتە نێوان کایەی ژیانی ماڵەوە و کایەی ژیانی سیاسییەوە.

بەهەرحاڵ رەگی هەموو دەسەڵاتێکی چینایەتی، رەگەزی، یان موڵکایەتی یان سیاسی دەچێتەوە سەر ئەو یەکەمین دەسەڵاتەی کە پیاو بەسەر ژندا پەیدای کرد، دیارە لە هەر دەسەڵاتداری و زاڵییەکی دیکە قووڵتر و بەرینترە.. ئەمەش لە

هەموو سەردەم و لە گشت شارستانیەتەکاندا رەنگیداوەتەوە... بەهەر حاڵ هەرکە ئابووری بازار برەوی سەند و ئابووری ماڵەوە پاشەکشەی کرد ئیدی وەزعی ئافرەت خراپ بوو، کار گەییە رادەیەك ئافرەت لە چوار دیواری حەرەمسەراکاندا وە مێنیّ و رێگە نەدریّ هیچ بەشدارییەك لە ژیانی ئابووری یان سیاسی یان رۆشنبیریی شار بکات... هەندیّ حاڵەتی ریزپەڕی لیّ دەربکریّ ئیدی ئەو رێسایەی سوقرات دایڕشت :" للرجال السیاسە و للنساء البیت"بوو بەرێسای باو و دەوری ئافرەت هاتە سەر منداڵ بوون و بەرێوەبردنی جیهانێکی داخراو کە ماڵە... هەڵبەتە ئەو یاسا و رێسایانەی لە یونان و رۆمادا باو بوون و تا رۆژگاری ئەمڕۆکەش لە زۆر شوێندا راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ ماکیان دیارە و کاریان پێدەکریّ بەڵگەی زیندووی خراپی وەزعی ئافرەتە لەو دوو کۆمەڵگەیەدا!.. ئیدی لەگەڵ سەرهەڵدانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و دۆزینەوەی نووسین و موڵکیەتی تایبەتی و دروستبوونی دەوڵەتدا ئیدی سیستەمی پیاو سالاری چەسپی و ئیدی موڵکیەتی تایبەتی، بەبۆچوونی هەندیّ زانا و پسپۆری بواری ئابووری، رۆڵێکی یەجگار کاریگەری لە دروستبوونی کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا بینی. بۆ وێنە موڵکداری تایبەتی زەوی و زار، کۆیلەو کۆیلایەتی لەگەڵ خۆیدا هێنا، (کشتوکاڵ و ئاژەڵداری کردیانە کارێك کە جۆرە



سەقامگیرییەك لەسەر موڵکەکان چیّ بیّ) زێدە خۆراك و کەڵەکبوونی ئەم زێدە خۆراکییە (کە لە لای خێڵە کۆچەرییەکان کە لەسەر شکار و میوە دەژیان، گەمە نەبوو) کردییە کارێك کە یەخسیری جەنگ وەکو کۆیلە بێگاری پیّ بکرێت، ئیدی بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنان و دابەشبوونی کار بوونە هۆی ئەوەی بازرگانی و ئاڵ وێڵ زیاد ببیّ و ئیدی پاراستنی ئەم سیستەمە پێویستی بە دەسەڵات و بەرگری هەبوو. ئیدی لەو رۆژەوە پەیوەندییەکی نەپچڕاوە لە نێوان موڵکداری و بەکارهێنانی زەبر و زەنگدا پەیدا بوو. واتە کە موڵك پەیدا بوو، دەبیّ چەکیش پەیدا بیّ بۆ بەرگریکردن لەو موڵکە و پاراستنی. واتە دەسەڵات و هێز، زادەی موڵکایەتییە.

بەم پێیە هاوکات لەگەڵ پەیدا بوونی موڵکیەتدا، پەیدابوونی دەوڵەت بوو بەزەرورت. تەنانەت دەسەڵاتی سیاسیش دەبیّ پشت بە موڵکیەت ببەستیّ و جۆرەکانی موڵکیەت بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، ئیدی ئەمە بەگوێرەی قۆناغە مێژووییەکان گۆڕاوە و تا گەییوەتە قۆناغی دەوڵەتی بورژوازی کە دەکاتە دەوڵەتی فرۆشیاران و خودان بانك و پیشەسازان، ئەوجا بەرێوەبەرانی دەزگای دەوڵەت کە دەسەڵاتی خۆیان لە خودان سەروەت و سامانانەوە وەردەگرن.. جا لەم جۆرە سیستەمەدا ژنانیش دەبن بە بەشێك لە موڵکی خودان موڵکان... ئیدی ئەم

سیستەمە پیاو سالارییە هەزاران ساڵە بەردەوامە و مێژوو، مێژووی نێرە و بەو ئاسانییە جێی مێ ناکاتەوە، بۆیە بزاڤی ئافرەتان زۆر قورسە و تەنیا ئەوە نییە داوای گۆڕینی سیستەمی ئافرەت بکات، بەڵکو هەوڵێکی رەوا و دژوارە بۆ گۆڕینی هەر هەموو پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە رەگ و ریشەوە.کۆمەڵگەی ئەمڕۆی بەشەری، هەندێ حاڵەتی یەجگار کەمی لێ دەربکەی. کۆمەڵگەی پیاوە، هەزاران ساڵە پیاو دایمەزراندووە و پیاو رێبەری دەکات و بەشێوەیەکی گشتی لە پێناوی پیاودایە، واتە پیاو سالاری زاڵە بە سەر هەموو شتێکدا دیارە ئەم سیستەمە نێرینەیە سیستەمی هەڤرەکییە و رەنگدانەوە و دەنگدانەوەی دیمەن و رواڵەت و دیاردەی زەبر و زەنگ و دەسەڵات و جەنگ و لەشکر و لەشکرکێشییە.

هەڵبەتە ئافرەت، بەپێی توانای خۆی بنەماکانی ئەم سیستەمەی مەحکوم کردووە و هەوڵی داوە بۆ گۆڕینی بەتایبەتی لە ساڵی 1968وە. خەباتی ئافرەت هەم لەباری دایکایەتییەوەیە و هەم لە باری ژیانی شەخسی و کۆمەڵایەتییەوەیە. ئافرەت زیاتر روو بە رووی بێکاری دەبنەوە، لە پۆستە گرینگە ئابووری و کارگێڕی و سیاسییەکان مەحروم دەکرێن، تەنانەت لە ژیانی ژن و مێردایەتیشدا تەواو سەربەخۆنین. بێگومان بەشداری پراتێکی ئافرەت لە هەموو



پۆستە قیادییەکاندا دەسەڵات بەرەو ئیسانیەت دەبات و هەنگاوە بۆ بە مرۆڤانی کردنی دەسەڵات و هەموو کایەکانی دیکەی ژیان، دیارە ئەم گۆڕانە پێویستی بە گۆڕینی بونیاد و بنەما و زەینیەتە باوە پیاو سالارییەکانە، هەنگێ ئازاد کردنی ئافرەت دەبێ بە بەشێکی لە جیابوونەوە نەهاتووی پرۆسەی ئازادکردنی مرۆڤایەتی..کەواتە ئافرەت کلیلی کردنەوەی دەرگای بە مرۆڤانی بوونی دەسەڵاتە، تا زووتر هەموو مافێکی وەربگرێ ئەوەندە قازانجی تیرەی بەشەرە و زووتر دەگاتە ئاسودەیی.. فورییە دەڵێت:" پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و گۆڕانکارییەکانی سەردەم بەندە بە پێشڤەچوونی ئافرەت بەرەو ئازادی.. فراوان بوونی دەستکە وتێن ئافرەت بنەما و بناغەی هەموو پەرەسەندنێکی کۆمەڵایەتییە." بێگومان جیاوازی نێوان پیاو و ئافرەت لەناو پرۆسەی مێژوودا دروستبووە، چونکە نە ئافرەت جەوهەری تایبەت بەخۆی هەیە و نە پیاو، ئافرەت لەناو مێژوودا قاڵبی خۆی وەردەگرێت و پیاویش هەمان شت. وەکو چۆن سیمون دی بوفوار دەڵێت: "مرۆڤ بە ئافرەتی لە دایك نابێ، بەڵکو پاشان ئەو قاڵبە وەردەگرێت" واتە مێژوو ئەو خانەبەندییە دروست دەکات و ئەم مێژووە، بە دوورخستنەوەی ئافرەت، لە باری مرۆڤانییەوە هەژار بووە. چونکە لە باری مێژووییەوە شێوازی مالیجەی تایبەت بە ئافرەت

سەبارەت بە هەموو مەسەلەکانی هەبووە: لە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە بیگرە تا دەگاتە سیاسەت و رۆشنبیری و هونەر و زانست و باوەڕ. جا ئافرەت لە هیچ شوێنێکی دنیادا، وێرای ئەوەی بە هەندێ مافی خۆی گەییوە، پلە و پایەیەکی سیاسی یان کۆمەڵایەتی یان قیادی وەهای وەرنەگرتووە کە لەگەڵ ئەو دەوەرەدا بگونجێ کە لە بەڕەڤانیدا گێڕاویەتی هەڵبەتە گومان لەوەدا نییە کە رادەی پێشکەوتنی هەر کۆمەڵگەیەك بەندە بەرادەی ئازادی ئافرەتەوە.. جا مەسەلەی ئافرەت، مەسەلەی ناسنامەی ئافرەتە وەکو بوونەوەرێکی مرۆڤانی، شۆڕشی ئافرەت لە بنەڕەتدا، دژی سیستەمی پیاو سالارییە، لە پێناوی سڕینەوەی هەر جۆرە چەوسانەوە و سەرکوتکارییەکی چینایەتی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و رۆشنبیرییە، دیارە وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد یەکەمین چەوسانەوە و سەرکوتکارییەك کە مێژووی تیرەی بەشەر پشتی پێ دەبەستێ. ئەو سەرکوتکارییە بووە کە پیاو دژی ئافرەت بەکاری هێناوە... تا ئافرەت ناسنامەی مرۆڤانی خۆی بەدەست نەیەنێ، کۆمەڵگە ناتوانێ خۆی تازە بکاتەوە، خۆ تازە نەکردنەوەش، سەرەتای بۆگەن کردن و پاشان مەرگە.

رادەی رزگاری و ئازادبوونی ئافرەت پێوەر و پێوانەی رزگاری و ئازادییە بە شێوەیەکی گشتی... هەڵبەتە ئازادی ئافرەت و



یەکسانی ئافرەت لەگەڵ پیاودا، مەحاڵە بێتە دی تا ئافرەت لە کاری کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنەر بە دوور بێ و لە چوار دیواریماڵەوە بخزێ و هەر خەریکی کاری ماڵ بێ. جا بۆ ئەوەی ئافرەت ئازاد بێ، دەبێ لە بەرهەمهێناندا بەشداری جدی بکات و کاری ماڵەوە زۆر بەکەمی مژ و لی بکات... بەهەرحاڵ تا ئافرەت ئازاد نەبێ پیاویش ناتوانێ ئازادبێ، بەڕاستی ئابروچونێکی گەورەیە بۆ پیاو، خۆ هەڵخەڵەتاندنێکی گەورەیە کە بە چاوی خۆی کۆیلەیەتی و کۆیلاندنی ئافرەت دەبینێ و خۆی بە ئازاد بزانێ؛ رادەی ئازادی هەر کۆمەڵێك بە رادەی ئازادی ئافرەتی ئەو کۆمەڵگەیە دەپیورێ و پێوانە دەکرێت... جا ئازادی ئافرەت هەر بەوە نابێ کە دەزگاکان بگۆڕدرێن، بەڵکو دەبێ سەر لە بەری پەیوەندییەکانی ژیان، پەیوەندی نێوان دەسەڵات و هاو وڵاتی بگۆڕێ و خۆشەویستی ببێ بە ئاینی بێ سنووری هەر کەسێك.. بەداخەوە لە کۆمەڵگەی پیاو سالاریدا، زۆر جار و لە بوارێن سیاسی و ئابووری و رۆشنبیریی و دەسەڵاتداریدا ئافرەت رەپێش دەخرێت و دەکرێت بەرووکارێك بۆ شاردنەوەی دەسەڵاتی پیاو  سالاری لە هەمان کاتدا جۆرە درێژەدانێکە بە سیستەمی دەسەڵاتی پیاو سالاری و ئەو ئافرەتانەش لە بواری پراتیکی دا، لە پیاو پیاوانەتر داکۆکی لەو سیستەمە و پاراستنی ئەو سیستەمە دەکەن...

پێویستە کاژی پیرۆزی لە دەسەڵات فڕێ بدرێ و شەقڵی پیرۆزی پێوە نەهێڵرێ، هیچ شتێك لە مرۆڤ پیرۆزتر نییە و بایەخی هەر هەموو شتەكان بە مرۆڤەوەیە بۆیە دەبێ قاپی باغڵەمە بخرێنە خزمەتی مرۆڤەوە..

بۆیە بەبێ بەشداری تەواوی ئافرەت لە هەموو گایەكانی ژیان دا، ئاسۆی ئایندەی كۆمەڵگەی بەشەر، هیچ تروسكەیەكی نابێ.

## سەرچاوەکان:

1. رمزية المرأة في الرواية العربية
ط 1 نيسان 1981 جورج طرابشي
2. في سبيل ارتقاء المراة، روجية كارودي ت/ جلال مطرجي ط1/ 1982 دار الاداب بيروت
3. جغرافية الملذات/ الجنس في الجنة ابراهيم محمود ط1 1998.
4. فصول عن المراة / هادي العلوي ط2/ 2003 دار المديَ للثقافة و النشر



## ((1))

گەلێك لەو ئافرەتانەی كە لە بزووتنەوەی ئازادیی ئافرەتاندا كار دەكەن و ئاگایان لە كتێبی (1) "بنەمای خێزان، موڵكایەتی و دەوڵەت" ی ئەنگلز هەیە، باوەڕیان وایە كە سەرچاوەی ئەو زوڵم و ستەمەی لە ئافرەتان دەكرێ دەگەڕێتەوە بۆ كۆمەڵگەی چینایەتی. دیارە ئەوانە زۆر بەدروستی وشەی "رەگەز

بالآیی"یان (2) بۆ شرۆڤەکرن و روونکردنەوەی سیستەمی کۆمەڵگەی سەرمایەداری– دوا قۆناغی چینایەتی – بەکارهێناوە. چونکە ئەو سیستەمە لەگشت بوار و کاروبارەکانی ژیاندا، ئافرەتی جیاکردۆتەوە.

ئەوەی ئافرەتان لێی دڵنیانین ئەمەیە، کە ئاخۆ پێکهاتەی بەدەنی ئافرەت بۆتە هۆی هاتنە خوارەوەی پایەی کۆمەڵایەتی ئافرەت و وایکردووە بە رەگەزی پلە دوو بێتە ژماردن؟ ئەم دڵنیانەبوونە لە کۆمەڵگەی ژێر دەسەلاتی پیاودا تەواو بەجێیە و هۆکارەکانیشی ئاشکران، چونکە نەك هەر مێژوو لەلایەن ئەو کەسانەوە نووسراوە، کە ئەم بارودۆخەی ئێستەیان هێناوەتە ئاراوە و پیادەیان کردووە، بەڵکو سەر لەبەری زانستەکانیش لەژێر رکێفی ئەواندان. بۆیە لێرەدا هەردوو زانستی بایۆلۆژی و و ئەنترۆپۆلۆژی بایەخێکی زۆر مەزنیان لە بواری ناسینی ئافرەت و مێژووی ئافرەتاندا هەیە. ئەم دوو زانستە بەڕادەیەك خراونەتە خزمەتی پیاوەوە کە لە بری ئاشکرا کردنی حەقیقەتەکان، هەوڵی شاردنەوەیان دەدەن. سەیر دەکەین پڕ زیانترین بانگەشەی درۆزنانەی زانستی، دەربارەی یەکەم زانینی رەگەزی مێینە بە نێوی زانستی بایۆلۆژییەوە ئەنجام دەدرێ. بەقسەی ئەم ئەفسانە سازانە، ئافرەتان بە حوکمی پێکهاتەی بەدەنی و ئەرکی دایکایەتییەوە، لەباری فیزیکییەوە لە پیاوان



دواکەوتووترن. ئەوان، ئەم کێشەیە وا دەخەنە بەرچاو، کە بێ توانایی ئافرەت ئەنجامی قۆناغەکانی پێشووە. ئەنجامی ئەو ژیانە حەیوانییەیە کە ئافرەتی ناچارکردووە وابەستەی رەگەزی بالا و زاڵی پیاو بێ. واتە تەبیعەت و سروشت بە مەسئول و بەرپرسی مەحکوم بوونی هەمیشەیی ئافرەت و سووك تەماشکردنی دەزانن. ئاشکرایە کە مێ و نێر لەباری پێکهاتەی فیزیکییەوە لێکدی جیاوازن، چونکە مێینە منداڵدانی هەیە و ئەمە هۆیەکە بۆ بە دایك بوون. ئەمە راستە، بەڵام هەرگیز تەبیعەت لەو زوڵمە مەسئول و بەرعۆدە نییە کە لە ئافرەت دەکرێ. ئەم زوڵمە، بێ چەند و چۆن زادە و بەرەنجامی ئەو بنەما کۆمەڵایەتی و یاساییانەیە کە لە کۆمەڵگەی چینایەتی پەتریارکیدا (3) بەدەستی پیاو داڕێژراوە.

بەهیچ جۆرێ لە کۆمۆنە سەرەتاییەکانی کۆمەڵگە لە چین بەدەرەکاندا یان لە جیهانی گیانلەبەراندا بوونی نەبووە نییە.

ئەم شێواندنە مێژوویی– کۆمەڵایەتی و سروشتییە خۆی لە خۆیدا پاکانەیە بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی کە لەسەر بناغەی جیاوازی رەگەز رۆنراوە. پەردەیەکە بۆ شاردنەوەی ئەو زوڵمەی لە ئافرەت دەکرێ. هەڵبەتە مەبەست و ئامانجی ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە: ئافرەت بۆچی لە پێناوی لابردنی ئەم بێدادییەدا خەبات بکات و بێهودە بەدووی هەڵلای یەکسانی بکەوێ. لە

کاتێکدا سەر لەبەری گێروگرفت و کێشەکانی بۆ پێکهاتەی بەدەنی خۆی دەگەڕێتەوە ؟! بۆچی بەبێهودە هەوڵی گۆڕینی باری کۆمەڵایەتی خۆی بدات، لە کاتێکدا هەرگیز ناتوانێ پێکهاتەی بەدەنی خۆی بگۆڕێ؟! هەڵبەتە بەدرێژایی ساڵانی دوورودرێژ، لە بێشکەوە تاکو گۆڕ، ئەم بیرە لە گوێچکان ئاخنراوە، کە مەحاڵە ئافرەت لە چارەنووسی خۆی رزگار بێ. بۆیە باشترین کاری ئافرەت ئەوەیە کە دان بەم راستییەدا بنێ و بێ چەند و چوون مل بداتە خەت و تەسلیم ببێ، ئەوەی راستی بێ چارەنووسی ئافرەت هەر ئەوەندە پەیوەندی بە پێکهاتەی بەدەنییەوە هەیە کە چارەنووسی پیاو پەیوەندی بە پێکهاتەی بەدەنی خۆیەوە هەیە. چونکە ئەگەر بڵێین ئافرەت تەنیا هۆیەکە بۆ زاوزێ و منداڵ هێنان، ئەوا لەو حاڵەدا پیاویش دەکاتە ئەو ئەسپەی کە تایبەتە بۆ تۆم لێگرتن. ئەم مامەڵە و بۆچوونە، پایەی مرۆڤ تا رادەی حەیوانییەت دێنێتە خوارێ، مرۆڤ باڵاترین بوونەوەری جیهانە، چونکە ژمێژە خۆی لە کۆتی ژیانی حەیوانانە و مەرجە پێشوەختەکانی سروشت رزگار کردووە. جا بۆ تێگەیشتن لە رەگەزی پیاو و ئافرەت با سەرەتا بێینە سەر لێکۆڵینەوەی جیاوازییەکانی مرۆڤ و گیانلەبەر، چونکە بەمە پایەی مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی تایبەتی، لە نێو



سەر لەبەری گیانلەبەراندا بەدیار دەکەوێ.

((2))

## مرۆڤ، شای بوونەوەران:

لەو سەردەمەوە کە داروین بەبەڵگە رەگی مرۆڤی بردەوە سەر جۆرە مەیمونێکی باڵا، ئیدی گەلەك تۆژینەوە لەمەڕ لێکچوونی مرۆڤ و گیانلەبەر ئەنجامدراوە، بەڵام مەخابن کەمتر ئاوڕ لە مەسەلەی جیاوازی نێوان مرۆڤ و باقی گیانلەبەران دراوەتەوە.مارکسیستەکان، زۆر بەدروستی سەرچاوەی ئەم شایستەییەی مرۆڤیان دەست نیشان کردووە و بەستویانەتەوە

به کارکردن و بەرهەمهێنانی پێداویستییەکانی ژیان. تیۆری کارو(4) پەیوەندی بەرەچەڵەکی مرۆڤەوە، هەوەڵین جار لەلایەن ئەنگلزەوە، لەگوتاری "دەوری کار لە گۆڕینی مەیموونەوە بۆ مرۆڤ" خرایە روو.

پێشەوایانی ئارکیۆلۆژی ئەنترۆپۆلۆژی وەکو: شرووود و واشبۆرن(5) ولیام هاولز (6)، کۆت ئۆکلی و (7) گوردن چایلد (8) دروستکردنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بەپێوەری جیاوازیی نێوان مرۆڤ و گیانلەبەران دەزانن. زاشبورن لەم بارەیەوە دەڵێ :"رەوتی خەملێنی بەشەر و گەیشتنی بەم قۆناغەی ئەمڕۆی شارستانییەت، لەگەڵ دروستکردنی سادەترین هۆی کارکردندا سەری هەڵداوە و دەستی پێکردوە".(9)

گۆردن چایلد- یش بەمجۆرە پشتیوانی لە تیۆرەکەی ئەنگلز دەکات :"ئارکیۆلۆژی پێش زایین، ئەوەمان نیشان دەدا کە چۆن مرۆڤی سەرەتایی بەهۆی کارەوە بووە بە بوونەوەرێکی باڵا، واتە بووە بە ئینسان".(10)

ئەوانەی کە بایەخێکی کەم بۆ کارکردن دادەنێن، دەڵێن مەیمونانی پەرسەندوو، سوود لە شتەکانی ناو سروشت وەکو هۆیەك وەردەگرن. بۆیە بەم پێیە ناشێت کار و کارکردن وەکو فاکتەرێکی سەرەکی بۆ بە مرۆڤ بوون بژمێردرێ. هەرچەندە گیانلەبەرانی... گواندار سوود لە دەستی خۆ وەردەگرن و



"دەشێت لەکاتی گرتن و دیل کردنیاندا گەلەك کاری دەستییان فێر بکرێ". بەڵام هیچ بوونەوەرێك جگە لە مرۆڤ توانای دروستکردنی هۆ و ئەوزارەکانی کارکردنی نییە. دابەشکردنی کار لەنێو گیانلەبەراندا نەبووە. هەروەها مانی هیچ بوونەوەرێك بەر لە مرۆڤ بەکاری سیستماتیکییەوە بەند نەبووە. ئەدمسون هبل (11) پێی وایە :"ئەو دەستانەی کە میوەیان پێ لەدرەختان کردۆتەوە و ئەو بازوانەی کە خۆراکیان پێ گوێزراوەتەوە بۆ دەم، تەنیا هۆیەك بوون بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی مەیمونانی مرۆڤ ئاسا"(12). بەپێچەوانەوە، چارەنووسی مرۆڤ هێندە ئاوێتەی کارکردن بووە کە ئەگەر ئەم توانای بەرهەمهێنانە لەنێو ببرێ، ئەوا تیرەی بەشەر زوو بەزوو لەسەر زەمین دەسڕێتەوە. کار و کۆشش، رێگایەکی تازەی بۆمان و پێشکەوتنی جۆرە بوونەوەرێکی تایبەتی، واتە مرۆڤ فەراهەم کردووە. بۆیە ئەرکی ئێمە هەر ئەوە نییە هاوەڕگەزی بەشەر "منداڵ" بەرهەم بێنین، بەڵکو پێداویستییەکانی ژیانیش بەرهەم دێنن. بایەخی بەرهەمهێنان و کارکردن بەئاشکرا لەو گۆڕانکاریانەدا دەبینرێ کە کار بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و سروشتیدا هێناوە. گیانلەبەران لە بنەڕەتدا کۆیلەی سروشتن و دەستە وەستانن بەرانبەر بەدەسەڵاتەکانی سروشت و ئەو رووداوانەی لە دەرێی کۆنترۆڵ و بەدەسەڵاتی

گیانلەبەراندا روو دەدەن. بەڵام مرۆڤ ئەم پەیوەندییەی ئاوەژوو کردۆتەوە. مرۆڤ لە رێگەی کارەوە، پەلاماری ناوجەرگەی سروشتی داوە و نەك هەر لە کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی راستەوخۆی سروشت خۆی دەرباز کردوە، بەڵکو بەسەر زۆر حوکمی پێشوەختەی سروشتیشدا زاڵ بووە و خستویەتییە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. دەتوانین بڵێین مێژووی گیانلەبەران پێشوەختە نووسراوە و لە دەرێی خۆیدا بەسەریا سەپێنراوە. بەڵام مرۆڤ بەدەستی خۆی  مێژووی خۆی تۆمار دەکات.

مرۆڤ بەزەبری رامکردنی سروشت، زۆر پێداویستی نوێی هێنایە ئاراوە. ئەمەش بۆ خۆی جۆرە تایبەتمەندییەکە، کە لە جیهانی گیانلەبەراندا نابینرێ. لەکاتێکدا پێداویستییەکانی گیانلەبەران لە بازنەی پێداویستییە سروشتییەکانی وەك: خواردن و زاوزێ تێناپەرێ، بەڵام مرۆڤ پێداویستی بێپایانی ئاڵۆزی بۆ خۆی هێناوەتە ئاراوە. بۆ وێنە پاش دروستکردنی تەوری بێدەسك، پێداویستی تەوری دەسکدار هاتە کایەوە، پاش هۆیە سەرەتاییەکانی زەوی کێڵان، پێداویستی گاسن هاتە ئاراوە. کاری تەشیرێسی گۆڕا بەکاری سەنعەتی چنینکاری، بەهەر حاڵ، پێداویستی کردییە کارێك کە مرۆڤ دەستبەرداری کوختەکان ببێ و شان بداتە بەردروستکردنی کارگەی گەورە و تەلاری سەر لە هەور. هەر پێداویستی وایکرد مرۆڤ لە



عەرەبانەی تریشقەوە بیر لە دروستکردنی سیستەمی گوێزانەوە و بارکێشی توندڕەوی وەك :" قیتار، ئۆتۆمبێل، فڕۆکە و کەشتی ئاسمانی" بکاتەوە، کە هەر هەمووی پاش شۆڕشی پیشەسازی هاتنە دی.

چەندین خواستی رۆشنبیری لە بوارەکانی :فێرکردن، پەروەردە، هونەر و زانستدا، هاوکات لەگەڵ چالاکییە تازەکانی مرۆڤدا لە چوارچێوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا هاتە ئاراوە، تەنانەت پێداویستییە سەرەتاییەکانی مرۆڤیش وەك: خۆراك و خواردن و پێداویستییە سێکسییەکانیش گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و بەرەو چاکتر چوون. خۆراك و هەڵبژاردنی هاوسەر و منداڵبوونی مرۆڤ لە هی گیانلەبەران جیاوازە و مارکس گوتوویەتی:"برسێتی، هەر برسێتییە، بەڵام ئەو برسێتییەی کە بەپلە گۆشتێکی کوڵاو دەشکێ و بە چەقۆ و چەتاڵ دەخورێ، جیاوازە لەو برسێتییەی کە بە پارچە گۆشتێکی نەکوڵاو دەشکێ و بە چنك و ددان دەخورێ" (13). مرۆڤ، شان بەشانی ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ژینگەی خۆیدا–لە سروشتی دەرەکی دا– ئەنجامی داوە، گۆڕانکارییەکی داخیلیشی لە خودی خۆیدا ئەنجامداوە. بە درێژایی چەندین سەدەی دوا بەدوای یەك، قەڵافەت و رواڵەتی مرۆڤی توکنی هەڵگری گەلێك دیمەن و رواڵەتی تری مەیمونانە، گۆڕانی

بەسەردا هات و لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە خودی کۆمەڵایەتی بەرەبەرە جێگەی کاردانەوە ئاژەڵییەکانی مرۆڤی گرتەوە. تیرەی بەشەر ئەمڕۆکە، زۆربەی هەرە زۆری غەریزە ئاژەڵییەکانی خۆی لەدەست داوە و رەفتاری شارستانی و کۆمەڵایەتی گرتۆتە بەر (14). ئەم سوکە بەراوردە خێرایەی نێوان مرۆڤ و گیانلەبەران، هەر هەموو ئەو بۆچوون و تیۆرانە بەدرۆ دەخاتەوە کە گوایە مرۆڤیش جگە لە گیانلەبەرێکی فێڵاوی چیدی نییە. هەر چەندە مرۆڤ لەهێندێ رووەوە لە گیانلەبەران دەچێت، بەڵام خۆی لە پلە نزمەکانی ژیان و بوونی گیانلەبەرانە زۆر پتر باڵا بردوە. ئێمە بەهۆی چالاکی بەرهەمهێنان و هێز و توانا کۆمەڵایەتییەکانەوە. بە رادەیەك خۆمان گۆڕیوە، کە چیدی نابین بە کۆیلەی پێکهاتەی بایۆلۆژی خۆمان. واتە لەوە دەرچووین کە ئیدی پابەندی پێکهاتەی بەدەنی خۆمان بین. وەکو مارشال سالینز(15) دەڵێ :" ئازادبوونی کۆمەڵگەی مرۆڤ لە کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی راستەوخۆی فاکتەرە بایۆلۆژییەکان، گۆڕانێکی فرە مەزن بوو.. ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ بەهۆی ئاستی هوشیاری مرۆڤەوە دیاری دەکرێ، نەك بەهۆی پێکهاتەی بەدەنی مرۆڤەوە. ئەم خاڵە، (16) سەرەتای رەتکردنەوەی ئەو ئەفسانەیەیە کە دەڵێ :" پێکهاتەی بەدەنی ئافرەت، چارەنووسی ئافرەت دیاری



دەکات" با ئێستاش بێینە سەر ئەوەی کە ئافرەت لەبەر رۆشنایی "تیۆری منداڵدان" (17) دا بخەینە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە.

((3))

## منداڵدان، فاکتەری نزمی رەگەزی مێینەیە :

بایۆلۆژی- یش وەکو ئەنترۆپۆلۆژی، زانستێکی تازەیە و بەر لێشاوی زۆر بەدلێکدانەوە و ئەنجامگیری سەرڤە سەرڤە و هەڵێنجانی هەڵە بووە. بەتایبەتی لەباری کۆمەڵایەتی- سیاسییەوە. ئەوەی کە مەسەلەی ناسینی رەگەزی مێینەی ئاڵۆزاندوە، بوونی هێندێ زانای بایۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی کۆیلە و ئەڵقە لە گوێی ئایدۆلۆژیای بورواژییە. ئەوانە رایان وایە کە مادامەکێ ئافرەت منداڵدانی هەیە و ئەم منداڵدانەش تایبەتە بە

منداڵ بوون، بۆیە ئافرەت هەرگیز ناتوانێ خۆی لە کۆنترۆڵی راستەوخۆی بەدەنی دەرباز بکات. ئەم تیۆرییەش، بەهەمان ئەندازەی تیۆری دەعبای پیاوەتی (18) بێ مەعنایە. هەردوو بۆچوونەکە سورن لەسەر ئەوەی کە ئامێری رەگەزی ئافرەت و پیاو توانای هەردوو رەگەزەکە دیاری دەکات. ئافرەت بەگەوج و گێل حسێب دەکرێ؛ چونکە کاری بەدەنی رێگەی پەرەسەندنی مێشك و بیر و بەهرەکانی دی لێدەگرێ و نایەڵێ بگاتە ئاستێکی باڵا و شایستە. بەڵام پیاو بەحوکمی ئامێری نێرینە دەتوانێ هۆش و بیرو و زیرەکی و باری کۆمەڵایەتی خۆی بەرەو باشتر پەروەردە بکات. دیارە هەردوو تیۆرییەکە ئەفسانەن و... هیچ...هیچ بنج و بناوانێکی زانستییان نییە.

ئەوی راستی بێ لەدنیای گیانلەبەراندا رەگەزی نێربێ توانایە نەك رەگەزی مێ. مێژوو پڕە لە بەڵگەی بنجبڕ، کە پیاوان لەپێناوی گەیشتن بە ئافرەت بە گژ یەکدیدا دەچن. هەرچەندە ئەم کارە زۆر جار دەخرێتە خانەی ئێرەییەوە، بەڵام ئەمە بە واتای ئارەزوو و خولیای گەیشتن بەیەك ئافرەت نییە. ئەمە خۆی لە خۆیدا غەریزەیەکی شەڕخوازییە و هەرگیزبەهەستی ناسکی مرۆڤ دۆستانە و بەمەبەستی هەڵبژاردنی تاقە ئافرەتێك مشت وماڵ نەکراوە. رەگەزی نێرینە بۆ پاراوکردنی غەریزەی نێرایەتی خۆی هەوڵدەدا بەزۆرترین ژمارەی ئافرەت بگات.



نێرەی گیانلەبەران هێندێ جار لەبەر خاتری جووتبوون لەگەڵ مێینەدا و هەندێ جاریش تەنانەت بێ ئەم بیانوەش بەگژ یەکدیدا دەچن. وەکو "ساڵی زوکرمن" (19) دەڵێ :" گیانی شەڕخوازی گیانلەبەران لە وەرزی جوتبوون و خوێن جماندا بەزۆری بۆ نیشاندانی باڵادەستی مەرجە بەدەنییەکانە نەك لەبەر خاتری گیانلەبەرێکی مێ" (20) هەر لەبەر ئەم خاسیەتە شەڕخوازییەیە، کە گیانلەبەرانی نێرە، بەزۆری بەتەنێ و دوور لەکۆمەڵی دەستەجەمی دەژین. گیانلەبەرە هەندێ پەرەسەندووەکان، لەبواری خۆراك و چالاکی سێکسیدا بەناچاری تەحەمولی یەکدی دەکەن. دیارە ئەم لایەنە لاوازەی رەگەزی نێر، لەبواری هاریکاریدا مەسەلەیەکی زۆر جدی بۆ پەیوەندییە گروپییەکانی نێو گیانلەبەران خولقاندووە. بەڵام لەرەگەزی مێدا، بەحوکمی بەهرەی دایکایەتی ئەم خاڵە لاوازە نابینرێ. دایکان لەگەڵ بێچووەکانیان کۆمەڵێك پێکدێنن. کە لەو کۆمەڵەدا پەیوەندی دایك و فەرزەند، زەمینەی گەشەکردنی بۆ دەرەخسێ. لەنێو هێندێ گیانلەبەری گوانداری وەکو شێردا، دایك و بێچوو بەکۆمەڵ و پێکەوە دەژین، کەچی گیانلەبەری نێرە کە دەکەوێتە ئاستەنگەوە تەنیا لەپێناوی ژیان و مانی خۆیدا دەکەوێتە پەلامار و خۆپاراستن. بەڵام گیانلەبەری مێ بەحوکمی هەستی دایکایەتی بیر لەپاراستنی خۆی و لە

هەمان کاتدا پاراستنی بێچووەکانیشی دەکاتەوە. زۆر نموونەی زیندوو هەن ئەوە ساغ دەکەنەوە کە گیانلەبەری مێ بەشێوەیەکی گشتی لە نێر بەهۆشترو زیرەکتر و وریاتر و بەتواناترە. راوچییان پێیان وایە کە گیانلەبەری مێیە، بە تایبەتی وەختێ لەگەڵ بێچووەکانیدا بێ زۆر دڕتر و وریاتر و بەپارێزترە. ئەم هوشیاری و زیرەکییە لەنێو هێندێ گیانلەبەری گواندارا پتر بەرچاو دەکەوێ، چونکە قۆناغی ئاوس بوون و ئاگاداری بێچوەکان درێژترە. "رابرت ئاردی"(21) ی لایەنگری سەر سەختی "پیاوبالایی"ش دان بەوەدا دەنێ کە : "هاوکات لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئاستی گیانلەبەراندا، توانای رەگەزی مێینە بەرز دەبێتەوە". ئالۆزی فیکری لای گیانلەبەری نێرە مایەی پەیداکردنی گیانلەبەری مێیە"(22) ڕابرت بریفالت (23)=ش بەڕاشکاوی " گیانلەبەرانی نێرە بە گەوجتر لە گیانلەبەرانی مێیە" دەزانێ. ئەم بۆچوونانە ئەوە ساغ دەکەنەوە، کە "تیۆری منداڵدان" ئەو بناغە پتەوە نییە تا بەکەم زانینی ئافرەتی لەسەر رۆبنرێ. بەهەرحاڵ تەبیعەت و سروشت زێدە بایەخێکی بەڕەگەزی مێ داوە، چونکە هەر رەگەزی مێیە مان و بەردەوامی بەبوونەوەران دەبەخشێ. خەسڵەتی منداڵبوون لەلای ئافرەت خۆی لەخۆیدا پایەیەکی تایبەتییە لە بواری خەباتی ماندا و هەر لەم رێگەیەشەوە



مەیمونانی مرۆڤ ئاسا توانای ئەوەیان پەیداکرد لە رێگای کارەوە سنووری شێوەی ژیانی سروشتی ببەزێنن و و بەرەو شێوەی ژیانی ئینسانی هەڵکشێن. لە قۆناغی پەرەسەندنی مەیمون بۆ مرۆڤدا، گیانلەبەری مێیە رێبەرایەتی ئەم گۆڕانکارییەی کردووە، نەك گیانلەبەری نێرە، چونکە توانا و گیانی هاریکاری خەسڵەتی بێچو هەڵهێنان بناغەی سەرهەڵدان و پەیدابوونی شای بوونەوەران، واتە مرۆڤ بووە.(24) بەمجۆرە تیرەی بەشەر لە رێگەی زاوزێوە، لەجیهانی ئاژەڵییەوە گەیشتە کۆمەڵگەی "داك سەروەری" و تەنێ لە قۆناغی چینایەتی "باب سەروەری" دا کە ملیۆنێك ساڵ پاش پەیدابوونی مرۆڤ هاتە ئاراوە، پایەی ئافرەت هاتۆتە خوارێ بۆ ئاستە حەیوانییەکە و بەهۆی لەدەستدانی بەها ئینسانییەکانییەوە لە مەیدانی ژیانی چالاکانەی کۆمەڵایەتیدا ناچاربووە ئەرکی دایکایەتی وە ئەستۆ بگرێ. لەو کۆمەڵگایانەدا کە لەسەر بنەمای موڵکایەتی تایبەتی و بالا دەستی پیاو رۆنراوە، ئافرەت بەحوکمی ئەرکی دایکایەتی. لەسەروبەندی سەرهەڵدانی ئەو جۆرە کۆمەڵگایانەوە گیرۆدەی کۆت و زنجیری ئەم زوڵم و ستەمە باوەی ئەمڕۆکە بووە. بەڵام ئەم هەلومەرجانەش دەستکردی مرۆڤن نەك دەستکردی سروشت. لایەنگرانی "تیۆری منداڵدان" دەیانەوێ لەم رێگەیەوە پایەی ئافرەت بێننە خوارێ و ئەوە بسەلمێنن کە

سەروەری پیاو شتێکی هەمیشەیی بووە و هەرواش دەمێنێتەوە. دیارە ئەم ئەنجامگیرییە تەنیا لەرێگەی شێواندنی زانستی بایۆلۆژیاوە و گۆڕینی بۆ ئەفسانەیەکی نازانستی، بەدەستدێت. لایەنگرانی "تیۆری منداڵدان " چەمکی کۆمەڵگەی باب سەروەری ئەمڕۆکە بەسەر جیهانی گیانلەبەرانیشدا تەعمیم دەکەن. لە خێزانی گیانلەبەریدا، هەروەکو خێزانی بەشەری، رەگەزی نێر بەگەورە و بەرعۆدەی دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان و پاراستنی ئافرەت و منداڵ دەزانن، بۆیە بە "رەگەزی بالای لەقەڵەم دەدەن ئەم گیانلەبەرە قارەمانە بە "رەگەزی نێری زاڵ" لە قەڵەم دەدرێ. وەکو لەزۆر چیرۆك و حیکایەتاندا هاتووە. گیانلەبەری نێر رۆڵی مێرد و باب لە کۆمەڵگەی مرۆڤدا دەبینێ. سەیرترین وێنەی ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە گیانلەبەری نێر وەکو شازادەیەکی بەتوانا بەرجەستەکراوە و رەگەزی مێ و کۆیلەی جۆراوجۆری مێینە دەوریان داوە و ژیان و چارەنووسیان لەدەستی ئەودایە. ئاخۆ چ حەقیقەتێك لە پشت پەردەی ئەم ئەفسانەیەوە خۆی مەڵاس داوە؟!



((4))

## رەگەزی نێرینەی زاڵ لە نێوان حەقیقەت و ئەفسانەدا

لە سروشتدا دیاردەیەك بەنێوی "رەگەزی نێری زاڵ" هەیە. چونکە وەکو پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، لەنێو گیانلەبەراندا، نێرەکان رقەبەرایەتییەکی یەکجار توند لەگەڵ یەکدیدا دەکەن. رەگەزی نێر، لەبواری سێکسیدا ئەو پەڕی توانا وەکار دەخات بۆ بەزاندنی خەنیمەکەی تالەم ریگەیەوە بالاترین پایە بۆ خۆی دەستەبەر بکات. ئەو گیانلەبەرەی لەم رێگەیەوە زاڵ دەبێت هەوڵدەدا بۆ ماوەیەك ئەم پایەیەی خۆی بپارێزێ، تا نێرەیەکی

بەهێزی تری لێ پەیدا دەبێت و بۆڕی دەدات. ئەو خاڵە سەرەکییەی کە لەبەر چاو ناگیرێ، یان دەشێوێنرێ ئەمەیە کە ئەم رقەبەرایەتییە تەنیا لەنێو نێرەکاندا ئەنجام دەدرێ. تەنانەت ئەو کاتانەش کە نێرەیەك خەنیمی خۆی دەبەزێنێ، یان لەنێوی دەبات، ئەمە نابێتە مایەی ئەوەی دەسەڵات بەسەر رەگەزی (مێ) دا یان کۆمەڵە (مێ) یەکدا بسەپێنێ. گیانلەبەری (مێ) یە لەوەیە تەنیا لەبەر خاتری ئاوسبوون و لێگرتن، نێرەیەکی بەهێز هەڵبژێرێ. دیارە ئەم هەڵبژاردنە لەگەڵ ئاوسبوونی مێیەکەدا ئیدی کۆتایی دێ. چونکە (مێ)یەکە لەو قۆناغەدا سەرگەرمی سکەکەی و نیگەرانی بێچوو هەڵهێنانی خۆی دەبێ.

گیانلەبەری مێیە، بێ گوێدان بەوەی کام نێرە زاڵە، پشت بەخۆی دەبەستێ و بەتەنیا خۆراکی خۆی پەیدا دەکات و بێ هاریکاری و کۆمەکی گیانلەبەری نێرە، پارێزگاری لەبێچووەکانی دەکات. واتا دەقا و دەق بەپێچەوانەی ئەو چیرۆکە منداڵانانەوە، کە زۆر جار لەلایەن پیاوانی بەناو زاناوە دێنە نووسین. لە جیهانی گیانلەبەراندا شتێکی لەبابەتی باوکایەتی نییە. لەوەیە لەنێو هێندێ باڵندە و ماسیدا، نێرەکان بۆ پاراستنی هێلکەکانیان هاوکاری لەگەڵ مێیەکاندا بکەن. بەڵام ئەمە ناگاتە ئەو رادەیەی کە ئەمانە لە شێوەی یەك



خێزاندا کۆبکاتەوە، بەڵکو جۆرە غەریزەیەکی مانە کە لەلایەن سروشتەوە داڕێژراوە. لەنێو زۆربەی بوونەوەراندا، بەتایبەتی لەنێو ئەو گواندارانەی کە مرۆڤیان لێ پەیدابووە، تەنیا دایکە کە ئەرکی منداڵ بوون و بارداری "سك پڕبوون" لە ئەستۆ دەگرێ. بریفالت دەڵێ :" گیانلەبەری پێگەیشتوو، نێر بێ یان مێ، خۆی بەرپرسی پاراستنی خۆی و پەیداکردنی پێداویستی رۆژانەی خۆیەتی". دایك نەبێ کە لەم حاڵە بەدەرەو خەمی دابینکردنی ئازووقە و خۆراکی بێچووەکانی خۆی دەخوات. بەشێوەیەکی گشتی، گیانلەبەری نێرە لەجیهانی گیانلەبەراندا ئەرکی باوکایەتی وەئەستۆ ناگرێ، چونکە ئەو گیانی کەللەڕەقی و شەڕخوازییەی کە تێیدایە لەم ئەرکەی دوور دەخاتەوە، تەنیا لە کۆمەڵگەی مرۆڤدا دەبینین کە نێرینە بەنێوی باوکەوە هاوکاری دایك دەکات، هەڵبەتە ئەم دیاردەیەش کاتێك پەیدابووە کە پیاوان خۆیان لە غەریزەی حەیوانی رزگار کردووە و بەرە بەرە خەسڵەتی مرۆڤانەیان وەرگرتووە. پیاوان لەمەیدانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا توانیویانە رەفتار و ئەتواری تازە هەڵبژێرن و رۆڵی باوکایەتی وەئەستۆ بگرن.

هەندێ جار دەگوترێ نێرینەی گیانلەبەران بەحوکمی کەللەڕەقی و شەڕخوازی خۆیان دەبن بەباشترین پارێزەرانی

خێزانی حەیوانی خۆیان. دیارە ئەم گوتەیە ئەفسانەیە و چ بنج و بناوانێکی زانستی نییە. لەنێو هێندێ گواندارانی باڵادا، هێندێ لە گیانلەبەرانی نێرە بەکۆمەڵ ئێشکی مێیەکان و بێچووەکانیان دەگرن، تا لە کاتی خەتەرا ئاگاداریان بکەنەوە، بەڵام گیانلەبەرانی نێرە هەرگیز لە پێناوی پاراستنی ئەواندا نەجەنگیون و لە کاتی خەتەر و مەترسیدا تەنیا بەرگرییان لە خودی خۆیان کردووە و دەکەن. لە جیهانی گیانلەبەراندا، هەر گیانلەبەرێ بگری لە پێناوی پاراستنی خۆیدا یان دەجەنگێ یان هەڵدێ. تەنیا دایکان لەم یاسایە بەدەرن و لە پێناوی پاراستنی بێچووەکانیاندا دەجەنگن، بۆیە ئەو شتەی کە پێی دەگوترێ "خێزانی حەیوانی" جگە لە ئەرکی دایکایەتی چ شتێکی دی نییە و بەهیچ جۆرێ لە خێزانی کۆمەڵگەی "باب سەروەری" ئەمڕۆکە ناچێت کە باب بەرپرسیاری پەیداکردنی خۆراك و پاراستنی ئافرەت و ماڵ و منداڵە. بەڵگەیەکی دیێ بۆ "پیاوباڵایی" دەهێنرێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە لە نێو هەندێ گیانلەبەراندا– هەڵبەتە نەك لەنێو هەموویاندا– نێرەکان لە مێیەکان گەورەترن و لەباری بەدەنی و ماسولکەوە بەتواناترن. دیارە بێ چەند و چۆن هۆی بەهێزی ماسولکە، دەگەڕێتەوە بۆ شەڕ و شۆڕی نێوان نێرەکان. هنری نیس (25) لەم بارەیەوە دەڵێ :" تا گیانلەبەری نێرە گەورەتر بێ، پتر خۆراك دەخوات



و بەهێز تر دەبێت و مێیەی زۆرتر دەخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوە"(26).

ئەگەر ئەم بۆچوونە بەمەبەستی نیشاندانی باڵا دەستی نێر بەسەر (مێ) دا بێ، ئەوا بۆچوونێکی هەڵەیە، چونکە ئەم بۆچوونە باڵا دەستی نێرەی بەهێز بەسەر نێرەی بێ هێزدا نیشان دەدات. لەسروشتدا مێ ڕەگەزی نێر هەڵدەبژێرێ. گیانلەبەری مێ، نێرەیەك هەڵدەبژێرێ کە ڕەفتاری هێدی و باش بێ و ئاسوودەیی بە مێیەکە ببەخشێت. ئەوەی مایەی سەرنجە ئەمەیە کە کاتێك گیانلەبەری (مێ) یە لەکاری ئاشقێنی دەبێتەوە و قۆناغی بارداری و ئاوسبوون دەست پێدەکات. بەتەواوی لەلایەن نیرەکانەوە پشت گوێ دەخرێ. بۆیە ئەگەر گیانلەبەری مێیە بەڕەگەزێکی لاوازی پشتبەستوو بەڕەگەزی نێر لەقەڵەم بدەین، ئەوا هەڵەیەکی گەورە دەرهەق بەگیانلەبەران و جۆری ڕەفتاریان دەکەین، باڵابوونی ڕەگەزی نێر لە خێزاندا وەکو یەکەیەکی کۆمەڵایەتی بەشەر، بەهەزاران ساڵ پاش دەستپێکردنی مێژووی بەشەریەت، سەری هەڵداوە، بەم پێیە دەبینین کە لەپێناوی شاردنەوەی ئەو زوڵمەی لە ئافرەت کراوە، زانستی بایۆلۆژی شێوێندراوە و سوودی ئاوەژوی لێوەرگیراوە.

((5))

## تیۆری راو فاکتەری هاتنە خوارەوەی پایەی ئافرەتە:

بەپێی ئەم تیۆرییە، دابەشکردنی کار لە کۆمۆنە سەرەتاییەکاندا لە نێوان هەردوو رەگەزی نێر و مێدا بەمجۆرە باس دەکرێ و دەخرێتە روو:
پیاو، کاری راو و جەنگی وەئەستو گرتووە و ئافرەتیش کاری کۆکردنەوەی خۆراك و ئەنجامدانی کاری ئاسایی رۆژانەی



لەئوردوگاکاندا لە ئەستۆ بووە، ئەم بۆچوونە ئەوە دەسەلمێنێ کە کاری پیاو بەسروشت کارێکی گرنگ بووە و کاری ئافرەت لە ئاستێکی نزمتر بووە، چونکە ئافرەتان بەحوکمی پێکهاتەی تایبەتی بەدەنیان ناچاربوون لەیەك شوێن نیشتەجێ ببن و منداڵ پەروەردەبکەن.
ئەم بۆچوونە، ئاوەژووکردنی واقیعە. چونکە گرنگترین کار لە رێگەی ئافرەتانی نیشتەجێی ماڵانەوە ئەنجامدراوە نەك لە رێگەی راووشکاری پیاوانەوە. با جارێ بێینە سەر ئامادەکردن و دابین کردنی خۆراك کە گرنگترین و بنەڕەتیترین و کۆکترین پێداویستی مرۆڤە. بەڵێ، ئافرەتان پتەوترین رۆڵی کۆمەڵایەتییان لە ئەستۆدا بووە، کە بریتی بووە لە کۆکردنەوە و دابینکردنی خۆراك و ئازووقە لەو قۆناغەدا کە راووشکار هێشتا جارجارە و بەرێکەوت ئەنجام دەدرا و پیاوان زۆربەی کات بە دەستی بەتاڵ دەگەڕانەوە، کۆمەڵ بەو خۆراکە دەژیا کە لەلایەن ئافرەتانەوە کۆدەکرایەوە، ئافرەتان، وێڕای پەیداکردنی خۆراکی رۆژانە، ئەرکی پاشەکەوت کردنی خۆراکیان بۆ ئایندەش دەستۆدا بووە. بەمجۆرە دەردەکەوێ کە بڕبڕەی پشتی کۆمۆنە سەرەتاییەکان، ئافرەت پێکی هێناوە. ئەمە تەنیا سەرەتاو دەستپێکردنی کاری ئافرەت بوو. پێویست ناکات لێرەدا بەدووی بەڵگەی دیدا بگەڕێین بۆ

سەلماندنی رۆڵی ئافرەت لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا. وەختی پیاوان سەرگەرمی گەڕان بوون بەدووی گیانلەبەران و راووشکارەوە، ئافرەتان سەرگەرمی بەرهەمهێنانی وەك: چەرم، ئامان و قاپ و قاچاخ، پیشەی دەستی لە بوارە جیاکاندا بوون وەك: بەنایی، پزیشکگەری و پەرەپێدانی جۆرەکانی زانست. لەکاتێکدا هەوڵ و کۆششی ئافرەتان لەبواری زەوی کێڵاندا بە ئامێری سەرەتایی بەرە بەرە گۆڕا بۆ پەیدابوونی کشتوکاڵ. ئافرەتان لەلایەکی دییەوە بە رێگەیماڵیکردنی گیانلەبەرانەوە گەیشتنە قۆناغی ماڵاتداری. ئەم پێشکەوتنە سەرەکییانە، نەك هەر پایەی شارستانیەتی دامەزراند، بەڵکو پیاوانیشی لەکۆت و زنجیری راووشکار ئازاد کرد و دەرفەتی بۆ رەخساندن کە بەرە بەرە بەشداری شێوە جۆراوجۆرەکانی بەرهەمهینان بکەن و لە ئەنجامدا دەسەڵات وەربگرن. کەواتە هەر ئافرەتان بوون کە وەکو یەکەمین زانایان، پەرستاران، مامۆستایان، ئاڵاهەڵگرانی کەلەپووری رۆشنبیری و پیشەیی گرنگترین ئەرکیان لەدابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتیدا لە ئەستۆ بووە نەك پیاوان.

گەورەترین هەڵەی ئەو کەسانەی کە کوێرانە لایەنگری لە رەگەزی نێرینە دەکەن، ئەوەیە کە سەر لەبەری ئەرکە قورسەکانی ئافرەتانی کۆمۆنە سەرەتاییەکان بەو کارە چکۆلانانە دەشوبهێنن کە لەماڵەوە ئەنجامدەدرێ.



لەو کۆمۆنە سەرەتاییانەدا، شتێ نەبووە بەنێوی خێزانەوە– بەومانا تەسکەی ئێستا– هەروەها چینێکی خۆشگوزەرانی دەسەڵاتدار لە ئارادا نەبووە تا رۆڵ و پایەی ئافرەت تا رادەی کۆیلایەتی و کارەکەری خێزان بێنێتە خوارێ ئافرەتانی کۆمۆنەسەرەتاییەکان سەروەرودەمڕاستی کۆمۆنەکان بوونە و نوێنەری یەکەمین کارگە و تاقیگە و مەڵبەندی پزیشکی و قوتابخانە و مەڵبەندە کۆمەڵایەتییەکانی دی بوونە. لەسەروبەندی داك سەروەریدا کاری دەستەجەمی ئەنجامداوە و هیچ جۆرە لێکچوونێك لەنێوان ئافرەتانی ئەو سەردەمە و نەوەکانی ئەمڕۆیاندا کە خزێنراونەتە کونجی ماڵان و دوور لەیەکدی دەژین، نییە.

مەبەست لەم قسانە ئەوە نیە، کە لە بایەخی کار و تواناو لێهاتوویی پیاوان لە بورای راووشکاردا کەم بکەنەوە، بەڵکو تەنیا بەمەبەستی بەرجەستەکردن و دیاریکردنی بایەخی راستەقینەی کاری پیاوانە لەو سەرو بەندەدا. لە راستیدا بەپێی ئەم تیۆرییە لنگە و قوچانە، نەك هەر کاری ئافرەت بەشتێکی بێبایەخ خراوەتە روو، بەڵکو کاری پیاوانیش وەکو پێویست نەهاتۆتە هەڵسەنگاندن. گرنگترین تایبەتمەندێتی پیاو لە بواری راووشکار و خۆراك پەیداکردندا ئەوە نەبووە، کە توانا و کارامەیی و لێهاتوویی نیشانداوە، بەڵکو ئەو پێشکەوتنە چۆنییە

بووە کە پیاوان لەچاو گیانلەبەراندا لەبواری هاریکاریکردنی یەکدیدا، بەدەستیان هێناوە.

زۆر ئاماژە بەوە کراوە کە راوکردنی گیانلەبەرانی گەورە و ترسناك پێویستی بەتوانا و کارامەیی پیاو هەبووە، ئەمە راستە، بەڵام ئەو مەسەلەیەی کە بایەخی زۆر مەزنی هەبووە و کەمتر ئاوڕی لێدراوەتەوە، ئەمەیە، کە پیاوان بۆ پێکهێنانی دەستەی راوچییان دەبوایە بەسەر سروشتی حەیوانانە و ئینکەبەرایەتی و تەنیایی و تاکڕەویدا زاڵ ببن. دەسەڵاتی پیاوانی راوچی بەسەر گیانلەبەراندا لەسەر ئەم بناغەیەڕۆنراوە، کە دەبوایە لە کاتی راووشکاردا بەهیچ جۆرێ یەکدی نەکوژن. دیارە ئەم پەیوەندییە ئینسانییە هەرگیز لە جیهانی گیانلەبەراندا نییە.

بۆیە پیاوان بۆ دابینکردنی خۆراك و ئازووقە سەرەتا فێری ئەوە بوون کە چۆن هاوکاری بکەن و پاشان زەمینەی راو هاتە ئاراوە و خۆشبوو. ئەم گۆڕانکارییە مەزنانە چۆن هاتنە ئاراوە؟ هەموو بەڵگەکان بوونی ئەم کۆمەڵگە سوسیالیستییە دەسەلمێنن کە لەلایەن تیرەی دایکانەوە رۆنراوە و پیاوانیان وەکو برای هاو نەژاد لە دەوری یەکدی خڕکردۆتەوە. وەکو چۆن بریفالت بۆی چووە:" لە کۆمەڵگەی مرۆڤدا هەمیشە مەیلێك بۆ لێکدی حاڵی بوون و دابینکردنی پەیوەندی یەکسانی و برایەتی هەبووە و هەیە".



ئەم مەیلە لەنێو گیانلەبەراندا نابینرێ. بۆیە مرۆڤی سەرەتایی پێداویستی ئاسایش و دامرکاندنەوەی غەریزەی سێکس لە شەڕخوازی و ئینکەبەرایەتیدا نابینێ. گیانلەبەران، نزیکترین هاو رەگەز و تەنانەت لف و جووتی خۆشیان لەپێناوی خۆراکدا دەکوژن، لەکاتێکدا ئەندامانی کۆنترین گروپە کۆمەڵایەتییەکانی سەرەتای بەشەرییەت، ئامادە بوون برسێتی بکێشن، بەڵام خۆراکی خۆیان لەنێو هاوگروپەکانی خۆدا دابەش بکەن، بۆیە لەسەرەتاترین گروپی بەشەریدا ئەو جۆرە شەڕە لەسەر زەوتکردنی ژنێك روونادات(27). تەنیا کۆمەڵگەیەکی سوسیالیستی بی چینایەتی دەیتوانی پێداویستییەکانی هەموو ئەندامانی کۆمەڵ لەسەر بناغەی یەکسانی دابین بکات و گیانی هاوکاری لەنێو ئەو خەڵکەدا بخولقێنێ کە جاران وەکو گیانلەبەران بەجیا و دوژمنانە دەژیان. لەو کۆمەڵگایانەدا، پیاوان و ئافرەتان بەپێی هەلومەرجی ئەو رۆژە کاریان بەسەر خۆدا دابەش دەکرد و پێشخستنی باری ئابووری و گوزەرانیان لەبەر چاو دەگرت. زۆر نووسەر، رۆڵی ئافرەتیان بەبچووك و رۆڵی پیاویان بەگەورە لەو کۆمەڵگایانەدا خستۆتە روو. بۆ وێنە (گراهام کلارك)ـی (28) ئارکیۆلۆژیست، ئافرەت بە بوونەوەیەکی سووك دەزانێ، کە وەکو ئەژدادە مەیمونەکانی خۆیان، کاریان تەنیا کۆکردنەوەی خۆراك بووە. کەچی

شكۆدارى پياوى راوچى بەيەكەمين نموونەى جەنگاوەرى رەگەزى بالاّ دەژميّرىّ(29). ديارە ئەم بۆچوونە لە دەمارگيرييەكى پياوانە بەولاوە چيدى نييە.

ئەلّمان سەرڤيّسى (30)–ى ئەنترۆپۆلۆژيست، هەمان بۆچوونى سەرەوە بە جۆريّكى دى دەخاتە روو. ئەم پيّى وايە پياوان بە حوكمى توانا و چاپوكى پتريان، پيشەى راووشكاريان هەلّبژاردووە، ژنان بۆيە بەشدارى راويان نەكردووە، چونكە پيّكهاتەى بەدەنيان لاوازوسكيان پڕ بووە (31) هەلّبەت من ئەوە دەسەلميّنم كە تايبەتمەنديّتى شەڕخوازى و خۆنواندن پياوانى بەرەو راووشكار بردووە، بەلاّم ئەو بۆچوونەى كە ئافرەتان لەبەر پيّكهاتەى بەدەنى تواناى راوكردنيان نەبووە، بەتەواوەتى رەتدەكەمەوە، هەر كەسيّك سەرنجى رەفتارى گۆشتخواردن و گيانلەبەرانى راوى بدات بە ئاسانى نادروستى ئەم بۆچوونەى بۆ بەديارەدەكەوىّ. چونكە رەگەزى مىّ لەبارى توانا و هيّزەوە هيچى لە رەگەزى نيّر كەمتر نييە. وەكو چۆن هيچ لاوازييەكى بەدەنى لەنيّوان شيّر و شەپالّ و نيّر و ميّى پلّنگدا نييە. لەلايەكى دييەوەهيّندە بەسە ئاماژە بۆ ئەوە بكرىّ كە زۆربەى ئەو كارانەى ئافرەتان ئەنجاميان داوە لەچاو پيشەى سەرەكى پياواندا، واتە لەچاو راوكردندا، كردويەتىّ كاريّك كە ئافرەتان نەپەرژيّنە سەر راووشكار.



لەكۆتاييدا دەلّيّم "تيۆرى راو" وەكو "تيۆرى مندالّدان" كە هەردووكيان تەواوكەرى يەكدين، بريتييە لە شيّواندنى حەقيقەتى هەردوو زانستى ئەنترۆپۆلۆژى و بايۆلۆژى، بەمەبەستى بانگەشە دژ بە ئافرەتان و بەرجەستەكردنيان وەكو "رەگەزى پلە دوو"

((6))

## ئايا ئافرەت هەميشە هەر چەوساوە بووە؟

لە سەردەمى سەرهەلّدانى بزاڤى ئازادى ئافرەتانەوە، هيّندىّ ئافرەتى نووسەر و تەنانەت ئەنترۆپۆلۆژيست–ش، لەژيّر كاريگەرى هيّندىّ بۆچوونى نازانستيانەدا گەييوونەتە ئەنجاميّكى پڕ لە نائوميّدى، ئەو ئافرەتانە باوەڕيان وايە كە ئافرەت نەك هەر لە كۆمەلّى باب سەروەريدا، بەلّكو لە هەموو قۆناغەكانى ميّژووى بەشەريەتدا هەر چەوساوە بووە. بەپيّى ئەمجۆرە بيرانە، ئافرەتان نەك هەر لە كۆمەلّى باب سەروەريدا،

جلّەویان بەدەست مێرد و باب بووە، بەڵکو لە کۆمۆنە سەرەتاییەکانیشدا، لەژێر رکێفی برا و خاڵوانی خۆدا بوون، ئێستاش لەجیهاندا هێندێ کۆمەڵی سەرەتایی هەن بەپێی رێبازی داك سەروەری دەژین. بەو کۆمەڵانە دەگوترێ کۆمەڵێ "داك رەچەڵەك"(*) چونکە دایکان لەو کۆمەڵانەدا رەوتی خزمایەتی دیاریدەکەن. بەڵام مەسەلەکە لەمە قوڵترە، چونکە لەم کۆمەڵگایانەدا وابەستەیی خێزان بەبابەوە، بە حاڵ گەشەی کردووە و پیاو، واتا مێرد، لەرێگەی ژنەوە دێتە ناسین نەك لە رێگەی پەیوەندی باب – فەرزەندییەوە.

واتە فەرزەندان وابەستەی دایك و خزمایەتی دایکن نەك وابەستی باب وباوان، ئەمیش ئەوە دەگەیەنێ کە منداڵ نەك هەر وابەستەی داك، بەڵکو وابەستەی خاڵوانیش بووە، لەم بابەتە کۆمەڵگانەدا، خاڵوان جێگەی بابیان بۆ خوارزا گرتۆتەوە. هەر لەبەر ئەمەیە کە هەندێ جار بەم کۆمەڵگانە دەگوترێ "کۆمەڵگەی خاڵ سەروەری"(32) کە خۆی لە خۆیدا نیشاندەری پەیوەندی نێوان خاڵ و خوارزایە. کۆمەڵگەی "داك رەچەڵەك" کە پاشماوەی قۆناغی داك سەروەرییە و، لەژێر گوشاری کۆمەڵگەی باب سەروەریدا گۆڕاوە، نیشانەی ئەوەیە، کە سیستەمی کۆمەڵگەی داك سەروەری باڵا دەستتر بووە. لە راستیدا وەختێ کە لە سەدەی رابردوودا زانستی



ئەنترۆپۆلۆژی هاتە مەیدانێ، زۆربەی تیرە سەرەتاییەکانی(33) سەر رووی زەمین گۆڕانیان بەسەردا هاتبوو، خێزانی دووکەسی واتە ئەوەی "مورگان" نێوی دەنێ "خێزانی دوو کەسی" (34) لەم جۆرە کۆمەڵانەدا پەیدا بوو بوو.

بەڵام ئەو خێزانانە کە بەشێك بوون لە ژیانی دەستەجەمی کەسوکاری سیستەمی داك رەچەڵەك، بەئاشکرا جیاواز بوون لەو خێزانانەی کە لە سیستەمی باب سەروەری چینایەتیدا پەیدابوون. پیاوێك کە لە دەرێڕا دەهاتە نێو ئەو گروپە، وەکو مێردی ژن قبول دەکرا. وێڕای ئەوەی کە مێردان لەپێناوی دابینکردنی خواردەمەنی بۆ ژن و منداڵیان، هاوکارییان دەگەڵ یەکیدا دەکرد. ئەوجاش هەر وەکو پاشکۆی خاڵوان حسێب کراون و لە راستیدا پایەیەکی غەیرە رەسمی ونزمیان هەبووە. خاڵوان، سەرپەرشتیار و شەریکی بنەڕەتی ئابووری منداڵی خوشك بوون. ئەنترۆپۆلۆژیستە مەیدانییەکان چارەسەری مەسەلەکان لە روانگەی مێژووەوە رەتدەکەنەوە، لە لێکۆڵینەوەی ئەم تیرانەدا دووچاری جۆرە سەر لێشێوانێك دەبن. بۆ وێنە "مالانۆسکی (35) لەو لێکۆڵینەوە مەیدانیانەیدا کە دەربارەی خەڵکی دورگەکانی "تروبریند"(36)ی کردووە، بەم جۆرە بنەمای ماف دایکایەتی روون دەکاتەوە: ئێمە خەڵکی

تروبریندمان لە شێوەی تیرەیەکدا بینی کە لەسەر بناغەی داك رەچەڵەکی دمەزرابوو. لەم سیستەمەدا هەر دایك حسێبە و هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەدایکەوە بەندە. ئافرەتانی تر و بریند رۆڵێکی دیاریان هەیە لەپەرە پێدان و بەرێوەبردنی ژیانی ئابووری و بۆنە کۆمەڵایەتی و جادوگەری و تەنانەت بەرێوەبردنی تیرەشدا"(**) بەڵام چونکە ئەمانە بناغەیەکی پتەویان لەبواری پێکهێنانی خێزانی دوو کەسیدا هەیە، بۆیە مالانوسکی نەیتوانیوە مەسەلەی باب لەنێو ئەم تیرەیەدا ساغ بکاتەوە و وشەیەکی پڕ بەپێستی مانای وشەی باب بدۆزرێتەوە. بەپێی گوتەی خودی خەڵکی ئەو دورگانە وشەی "تاما"(37) کە مالانوسکی هەولێدا بە هاو واتای وشەی "باب" لەقەڵەم بدات، واتای "مێردی دایك" دەگرێتەوە و مانای باب ناگەیەنێ و بگرە لە هەندێ کاتدا واتای "غەوارە" و "بێگانەش" دەگەیەنێ. واتە ئەو پیاوە بێگانەیەی کە وەکو مێردی ژن نێودەبرێ و هێشتا پایەی باوکی نەدراوەتێ، لەراستیدا خاڵوان ئەرکی "باوکایەتی" دەستۆ دەگرن.
مالانوسکی دەڵێ:
"پایەی کۆمەلایەتی لەرێکەی دایکەوە بەهۆی خاڵەوە بەمندالێ خوشك دەسپێردرێ. ئەم جۆرە پێکهاتەی تیرەیە کە بە ئاشکرا لایەنی "داك رەچەڵەکی" پێوە دیارە. بایەخێکی یەکجار



گەورەی هەیە و ئەوە نیشاندەدا کە ئەندامانی ئەو جۆرە تیرەیە، لە رێگەی خزمایەتی، هەستی لێکچوو، بەرژەوەندی هاوبەش و خوێنەوە پێکەوە گرێدراون.
لەم جۆرە تیرانەدا تەنانەت ئەوانەی کە لە رێگەی ژن و ژنخوازییەوە پەیوەندی باب و فەرزەندییان پەیدا کردووە" بەتەواوەتی کەنار دەخرێن و فەرامۆش دەکرێن"(38) ئەوەی مالانوسکی لەمجۆرە پێوەندییەدا نێوی کاریگەری "دولایەنە"(39) ی لێدەنێ هەمان کاریگەری ژن و ژنخوازییە لە سیستەمی کۆمەڵگەی داك رەچەڵەکیدا. لەمجۆرە کۆمەڵانەدا فەرزندان چاویان لە دوو پیاوە کە بە داکیانەوە وابەستەن یەکێکیان خاڵ و ئەویتریان مێردی دایکە، مالانوسکی بۆیە ناتوانێ بەباشی دەرەقەتی دەستنیشانکردنی ئەم مەسەلەیە بێت، چونکە تیرەکانی تروبریند، نوێنەری کۆمەڵگەی داك رەچەڵەکن لەقۆناغی راگوزاریدا بەرەو کۆمەڵگەی "باب رەچەڵەك"(40).
سەر ئامەدانی ئەنترۆپۆلۆژی لە سەدەی رابردوودا، مامەڵەیان لەتەك زۆر نموونەی کۆمەڵگەی داك رەچەڵەکی رەوتەنی "انتقالی" بەرەو کۆمەڵگەی باب رەچەڵەك و پاشان بەرەو کۆمەڵگەی باب سەروەری، کردووە، وەکو چۆن سیدنی هارتلید (41) لەم رووەوە و بەپێی ئەزموونە مەیدانییەکانی خۆی

دەڵێ "دەسەلاتی کۆمەڵگەی باب سەروەری کە بەرە بەرە بۆتە هۆی بڕینەوە و تالانکردنی مافی ئافرەت لە هەموو جیهاندا، لە هەموو شوێنێکدا پاش قۆناغی راگوزاری "انتقالی" کۆمەڵگەی داك رەچەڵەك، سەقامگیر بووە".(42)پایەی ئافرەتان لەم کۆمەڵگە راگوزاریانەدا بەنزیکە وەکو خۆی ماوەتەوە و سەربەخۆیی ئابووری و رێزی کۆمەڵایەتی خۆیان هەبووە. بەڵام لە هەندێ ناوچەی دیدا، بەتایبەتی لە نێو ئەو کۆمەڵانەدا کەپەوەندی چینایەتی سیستەمی باب سەروەری لەسەر بنەمای ئابوورییەکی گەشە نەکردوو زاڵبووە، ئافرەتان وەکو دەستە خوشکەکانی ئەمڕۆیان، پایەیەکی نزمیان هەبووە و لەژێر ستەمی باب و مێرد و براکانیاندا ژیاون.

کیشوەری ئوستراليا نموونەیەکی گەش و زندوی پایەی نزم و سوکی ئافرەتە لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا. بەڵام بەبۆچوونی "سپنسەر"(43) و "گلین" (44) کە گەورەترین سەرچاوەن دەربارەی تیرە سەرەکییەکانی ئوستراليا، جیاوازییەکی قووڵ لەنێوان دەورانی کۆن و وەزعوحاڵی ئەمڕۆی ئافرەتان لەنێو ئەو تیرانەدا بەرچاو دەکەوێ. ئەوان پێیان وایە کە ئافرەتان لەم ناوچانەدا لە کۆندا پایەیەکی گەلەك بەرزتریان هەبووە و لە چاو ئەم سەردەمانەی دواییدا.(45)

رابرت بریفالت پوختەی ئەم مەبەستانە، ولێکۆڵینەوەکانی دی



بەمجۆرە دەردەبڕێ "بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵگەی باب سەروەری رۆنراو لەسەر بناغەی سەر دەستی پیاو و بندەستی ئافرەت، نیشانەی ئەو گۆڕانکارییە نەزۆر دورانەیە کە جێی بەپلە و پایەی بەرز و پڕ رێز و حورمەت و شکۆداری جارانی ئافرەت لەقکردووە". هەروەها دەڵێ:".. خەڵکی ئەسڵی ئوستراليا نەك هەر بەنەژادی سەرەتایی، بەڵکو لەزۆر رووەوە بەنەژادی سوك و نزم حسێب دەکرێن. بۆیە وەختێ پیاو دەبێت بە باڵا دەست و دەسەڵاتی راستەقینە وەردەگرێ، بەتوندترین شێوە خۆی دەنوێنێ و دەردەکەوێ.(46) دیارە ئەم مەسەلەیەش جێی سەرسوڕمان نییە بۆ کیشوەرێك کە لە ماوەی سەدەیەکدا سپی پێستان روویان تێکردووە و بەهۆی نەخۆشی و کۆمەڵێك گێروگرفتی دییەوە کۆمەڵگەیەکی 500 هەزار کەسی قڕی تێکەوتووە و بووە بە کۆمەڵگەیەکی پەنجا هەزار کەسی. هاوکات لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا هەندێ ناوچەی دی هەیە کە داك سەروەری تێدا وەکو خۆی ماوەتەوە و چ شتێك لەگۆڕێ نییە بەنێوی هاتنەخوارەوەی پایەی ئافرەت یان پیاو. ئەمجۆرە نموونەیە لەنێو سورپێستەکانی ئەمریکای باکووردا دەبینرێ، کە تا ئەو کاتەی خەڵکی شارستانی ئەوروپا بەویسکی و تفەنگەوە پەلاماریان نەدابوون، چ شتێك نەبوو بەنێوی سەردەستی پیاوان و بندەستی ئافرەت. بریفالت،

گوتەی کابرایەکی ڕۆحانی مەزهەبی بەنێوی "لاڤ تو"وە (47) بەمجۆرە نەقڵ دەکات:"سەردەستی ئافرەت حەقیقەتێکە ئاو لێڵ ناکات، هەر ئافرەت کۆکی و تەبایی لەنێو تیرەکاندا پیادە کردووە، ڕەسەنایەتی خوێن و سەجەلەی نەوەکان و سیستەمی زاوزێ و خێزان پارستنیان دەستۆ گرتووە. دەسەڵاتی ڕاستەقینە هی ئەوانە. هەڵبژاردنی شوێنی تیرە، هەڵبژاردنی مەزرا و کێلگە و موڵکایەتی بەروبووم بەدەستی ئەوانە، ئەوان هەوێنی ڕاوێژ و تەگبیر و دادپەروەری بێ چەند و چۆنی شەڕ و ئاشتین".(48)

بەپێی گوتەی "ئەلکساندرگۆلد"(49) دەسەڵاتی ئافرەت لەهەڵبژاردنی سەرانی تیرەدا، ڕەتکردنەوەی نەبووە. چالاکی سەرانی تیرە، بەتایبەتی لە بوارە جەنگییەکاندا لەلایەن ئافرەتانی دەمڕاست و هوشیارەوە چاودێری کراوە و ئامۆژگاری و ڕێنوێنی سەرانیان کردووە. خۆ ئەگەر ئاکامی کاروکردەوەی سەرانی تیرە جێگەی ڕەزامەندی نەبوایە، ئەوا ئەنجوومەنی ئافرەتانی دەمڕاست دژی دەوەستا و لەسەرۆکایەتی لایان دەبرد. لە سەردەمی کۆنفدراسی ئێراکیوس دا، (50) ئافرەتان هەم لە هەڵبژاردندا و هەم لە لابردنی سەران و خاوەن پلە و پایەکانی دیدا دەسەڵاتیان لە پیاوان پتر بووە. جڵەوی ڕای گشتی زیاتر بەدەستی ئافرەتانی تیرە بووە تا پیاوان زۆربەی



شەڕەکان دەبوایە لەپێشدا ئەنجوومەنی دەمڕاستانی ئافرەتان تەئیدی بکردایە.(51) دەسەڵاتی ڕاستەقینەی ئافرەتان لێرەوە بەدیاردەکەوێ کەزۆربەی هەرە زۆری قەواڵەکانی "سند" گواستنەوەی موڵکایەتی زەوی لە حکومەتی ئیستعمارییەکاندا بەئیمزای ئافرەتان ئەنجامدراوە.

یەکێك لە ناکۆکییە هەرە سەرنج ڕاکێشەکانی نێوان پیاوانی ئێراکوس و پیاوانی سپی پێست لە ڕووی جۆری بیرکردنەوەیان سەرباەت بەئافرەت، لەکتێبەکەی (برفالت)دا تۆمارکراوە، یەکێك بەنێوی "پیترخوب"، لە نامەیەکیدا بۆ "کلینتن"ی (52) فەرماندە، کە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ڕێزداری ئافرەتە لەلای سورپێستەکان، دەڵێ:

برادەرینە، ئەژدادی ئێمە، سەرپێچی کردنیان لە ئەنجوومەنی ئافرەتان و بەتایبەتی ئافرەتانی فەرماندە، بە گەورەترین خەتا دەزانی، ئەوان ئەو سەروەرانەیان "ئافرەتان" بەخودان و گەورەی سەرزەمین زانیوە و ئەوپەڕی ڕێزیان گرتوون. ئەژدادی ئێمە دەڵێن: جگە لە ئافرەت کێ ئێمەی هێناوەتە ئاراوە؟ جگە لە ئافرەت کێ زەوی کێڵاوە و چاندووە، ئاگری کردۆتەوە و مەنجەڵە خۆراکی ئامادەکردووە؟

برادەرینە، ئافرەتانی ئێمە نیگەرانن.. داخوازییان ئەوەیە هەمان ڕێزی سەردەمی ئەژدادمانیان لێبنرێ. ڕوح و گیانی

گەورە ئەوانی هێناوەتە ئاراوە. ئافرەتانی فەرماندە ئاواتەخوزان کە هەمان ئازادی سەردەمی باب و باپیرانمانیان بدرێتێ کە قسەی خۆ بکەن. چونکە هەر ئەوان ژیان و بوونی تیرەن.(53)

بریفالت، لە شوێنێکی دیدا ئەم قسەیەی "راك هیل"(54) نەقڵ دەکات: ئافرەتان چۆن توانیویانە قەناعەت بەنەوەیەکی یاسا نەناسی کێوی بکەن کە ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانڕەوایی تەواوەتی ئافرەتان بن؟ نەوە و نە تیرەیەك کە تەنانەت بە نابە دڵییەوە گوێڕایەڵی سەرانی تیرەکانی خۆیان دەکرد؟!

ئەم مەسەلەیە لێکۆڵینەوەی زۆر هەڵدەگرێ و (55) زۆر زەحمەتە ئەم بەڵگەنامەیە ئەو قەناعەتەمان لا دروست بکات، کە "ئافرەت هەمیشە هەر چەوساوە و زۆرلێکراو" بووە. ئەم حەقیقەتەش کە ئافرەت لەهەندێ ناوچەی سەرەتاییدا بەئەندازەی خوشکانی سایەی کۆمەڵگەی باب سەروەری کۆمەڵگەی شارستانیانەی ئەمڕۆ دەچەوسێنرێتەوە، دیسان ئەوە ناسەڵمێنێ کە ئافرەت هەمیشە هەر چەوساوە بووە، تاقە شتێك کە لەم مەیدانەدا دێتە سەلماندن ئەوەیە کە لە هەندێ ناوچەدا، نەك لە هەموو ناوچەیەکدا پایەی خاڵوان لەگەڵ هاتنە خوارەوەی، پایەی دایك و خوشکدا لەنێو ئەم تیرانەدا دابەزیوە وهاتۆتە خوارەوە. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ لەو خاڵوانانە



هێندەیان زوڵم لە ئافرەتان کردووە کە کتومت نموونەی پیاوی ئەمڕۆی دنیا بوونە.

بەڵام لە روانگەی مێژووییەوە، بەر لەوەی باب سەروەری ببێ بە باو، شتێك نەبووە بەنێوی باڵا دەستی پیاو بەسەر ژندا یان بەپێچەوانەوە. لەکۆمەڵگە تیرەییەکاندا، ئافرەتان وەکو خوشك و پیاوان وەکو برا پێکەوە دەژیان. ئەم کۆمەڵگانە لە هەموو بوارە ئابووری و کۆمەڵایەتی و رەگەزییەکاندا لەسەر بناغەی یەکسانی رۆنرابوون. بەم پێیە بەدیار دەکەوێ کە ئافرەت هەمیشە هەر چەوساوە نەبووە. چەوساندنەوەی ئافرەت ئەڵقەیەکە لە ئەڵقەکانی ئەو کۆمەڵگا ستەمکارەی کە دەسەڵاتی گرتە دەست و بوو بەبریکاری کۆمەڵگەی. داك سەروەری. لەحەقیقەتدا "تیۆری خاڵ سەروەری" مۆدێکی تری هەمان "تیۆری منداڵدان"ە و پێویستە لەمەیدانی بزوتنەوەی ئافرەتاندا پووچەڵی هەردوو تیۆرییەکە بێتە سەلماندن.

مەخابن هەندێ ئافرەتانی نووسەری بەتوانای وەك "کیت میلت"(56) هەرچەندە گاڵتەی بەتیۆری "پێکهاتەی بەدەنی ئافرەت، چارەنووسی دیاری دەکات" دێ، بەڵام ئاوڕی لەو مەسەلەیە نەداوەتەوە کە ئافرەت هەمیشە هەر چەوساوە نەبووە، ئەم کەسایەتییە ناسراوەی جیهانی بزاڤی ئافرەتان، کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەنترۆپۆلۆژیستانی دژ بە قوتابخانەی

مێژووەوە و لەکتێبی "سیاسەتی سێکس دا" دەنووسێت:
جیهانی سەرەتاکان و جیهانی شارستانیش هەردووکیان جیهانی پیاوانن(58) قەناعەتی وایە کە ئافرەت هەمیشە لە رێگەی باب سەرەوەری و پێشتریش لە رێگەی خاڵ سەرەوەرییەوە چەوسێنراوەتەوە.

مایەی سەرسوڕمانە کە بە خۆی دان بەوەدا دەنێ، کە نازانێ داخۆ کۆمەڵگەی داك سەرەوەری، لە رۆژگارێکدا هەبووە یان نا. فایرستۆن (59) لە کتێبی "دیالیکتیکی سێکس"دا(60) بە شێوەیەکی قوڵتر ئەم هەڵەیەی قبوڵ کردووە و هەمان ئیدیعای پیاو دووبارە دەکاتەوە. بەبۆچوونی ئەو مەسەلەی چەوساندنەوەی ئافرەت زۆر لە مێژووی نوسراو کۆنترە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمەکانی سەرەتای دروستبوونی تیرەی بەشەر. ئەو، باوەڕی وایە کە چالاکی بەرهەمهێنان، بەهۆی پێکهاتی بەدەنی ئافرەتەوە لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئافرەت بووە. دیارە بەمە نەزانی و بێ ئاگایی خۆی لەمەڕ ئەو بەڵگە نامانە دەسەلمێنێ کە نیشاندەری کاروکۆششی بەرهەمهێنانی ئافرەتن لە کۆمۆنە سەرەتاییەکاندا. ئەو، باوەڕی وایە کە ئافرەت بەحوکمی پێکهاتەی بەدەنی خۆی هەمیشە لەنێو رووداوە نهێنی ئامێزەکاندا لەقە فرتێ دەکات(61).

واتا بە نزیکە هەمان بیروبۆچوونی پیاوان دەربارەی سك پڕبوون



و زاوزێی ئافرەتان دووبارە دەکاتەوە. هەر لەم پێودانگەوە دەگاتە ئەم ئەنجامەی کە ئافرەت بەحوکمی لاوازی بەدەنی خۆی هەمیشە پشتی بەپیاو بەستووە، جا ئەو پیاوە چ برا یان مێرد یان باب بووبێ.

فایرستۆن، بەتەواوەتی کەوتۆتە کوێرەکوڵانی "تیوری منداڵدانەوە" و بۆچوونەکانی مارکس و ئەنگلز رەتدەکاتەوە و دەڵێ : ئەوان تەقریبەن چ شتێکیان لەمەڕ ئافرەت وەکو چینێکی چەوساوە نەدەزانی. بەردەوام دەبێت و دەڵێت: تایبەتمەندێتی زاوزێی ئافرەت بووە هۆی ئەوە کە ئەو هەموو زوڵمەی لێبکرێ، نەك سەقامگیربوونی کتوپڕی سیستەمی باب سەرەوەری(62). خات فایرستۆن. کە خۆی یەکێکە لەلایەنگرانی ئازادی ئافرەت، لە کۆتاییدا توتی ئاسا، تیۆری دژ بە ئازادی ئافرەتان، ئەو تیۆرییەی کە لە سەر بناغەی "پێکهاتەی بەدەنی ئافرەت چارەنووسی دیاری دەکات" رۆنراوە، دووبارە دەکاتەوە. دووبارەی دەکاتەوە بێ ئەوەی وەکو پێویست لەحەقیقەتەکانی کۆڵیبێتەوە.

مەخابن هێندێ ئافرەتی پسپۆر لە ئەنترۆپۆلۆژیدا، وێڕای ئاگادارایان و شارەزاییان لەم بوارەدا، کۆمەڵێك هەڵەی لەم بابەتەیان کردووە. ئەوانە لەژێر کاریگەری یان لە ترسی پەیرەوانی تیۆری باڵا دەستی پیاو و ئایدیۆلۆژیای بورژواییدا کە

لە بواری ئەنترپۆلۆژیدا جێی خۆی کردۆتەوە، پشتیوانی لە ئەفسانەی نزمبوونی هەمیشەیی ئافرەت دەکەن. پسپۆڕێکی ئەنترۆپۆلۆژی ئینگلیز بە نێوی لوسی میر (63) دەڵێ: لەسادەترین کۆمەڵگەی پیشەسازیدا، ئافرەت هەرگیز بەتەواوەتی سەربەخۆ نەبوونە و نین. ئافرەت هەمیشە پشتی بەپیاو بەستووە، ئیدی ئەو پیاوە برا یان مێرد یان باب بووبێ(64)، ئەمە بۆچوونێکی توندڕەوانەیە و تەنانەت دەربارەی کۆمەڵگەی داك رەچەڵەکەکانی سەردەمەکانی ئەم دواییانەش راست نییە کە ئافرەت سەربەخۆیی ئابووری و رێزداری کۆمەڵایەتی خۆی تێدا پاراستبوو، چ جای سەردەمانی داك سەروەری، کە سەردەستی پیاو وبندەستی ئافرەت بەهیچ جۆرێ بوونی نەبووە.

"کەتلین ئابرل"(65)چاکترین گوتاری رەخنەیی خۆی لەمەڕ کتێبی "خزمایەتی داك رەچەڵەکی"(66) نووسیوە، کە لە ساڵی 1961 دا بە بۆنەی سەدەمین ساڵڕۆژی مافی دایکەوە چاپکراوە. بەڵام ئەویش پێی وایە، کە ئافرەت هەمیشە هەر چەوساوە بووە. کەتلین، لەگوتارێکیدا کە لەم دواییانەدا بۆ بزووتنەوەی ئافرەتانی نووسیوە، دەڵێ: دەسەڵاتی پیاو کە بە بەردەوامی ئافرەت دەچەوسێنێتەوە، لەکەڵەکە بوونی ئەو سەرمایەیەوە دێ، کە دەوڵەتان پشتیوانی لێدەکەن، ئەمە



بۆچوونێکی مارکسیستییە، بەڵام کەتلین بەرە بەرە رێباز و شێوەی مەتریالزمی مێژوویی فەرامۆش دەکا و دەڵێ:
تەنانەت لەو کۆمەڵانەشدا کە پشتیان بە راووشکار بەستووە وا دێتە بەرچاو کە ئافرەت هەمیشە رۆڵی "رەگەزی پلە دوو"ی پێسپێردرابێ و کەموزۆر پاشکۆی پیاو بووە.(67) رەنگە ئەم بۆچوونە دەربارەی هەندێ کۆمەڵگەی پشت بەستووی بەڕاووشکار کە لە سەردەمەکانی ئەم دواییانەدا گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، راست بێ، بەڵام دەربارەی کۆمۆنە سەرەتاییە پشت بەستووەکان بەڕاو و دەربارەی سەروبەندی داك سەروەری دروست نییە. بۆ سەلماندنی ئەم مەبەستەش جارێکی دی دەیڵێمەوە: راوکردنی پیاو، بەهۆی سەردەستی و زاڵی پیاو بەسەر ئافرەتدا نەبووە، بەڵکو بەهۆی پەیدابوونی موڵکایەتی تایبەتی، ئیمتیازاتی چینایەتی و خانەوادەیی باب سەروەرییەوە بوو، کە پایەی ئافرەت هاتە خوارەوە.

((7))

## ئافرەت لە نێوان کاری کۆمەڵایەتی و کاری خانەوادەییدا

ئەم مەسەلەیە دەمانباتەوە سەر ئەو ئەفسانە بێ بنچ و بناوانەی کە "ئافرەت رەگەزی پلە دوو"ە، لایەنگرانی ئەم بۆچوونەش جیاوازی کاری ئافرەتانە و کاری پیاوانە چ لە کۆمۆنە سەرەتاییەکاندا و چ لە کۆمەڵگە شارستانییەکانی ئەوڕۆدا دەکەن بە بەڵگەی سەلماندنی دروستی و راستی بۆچوونەکەیان. بەپێی بانگەشە باوەکان، دابەش کردنی کار لە نێوان پیاو و ئافرەتدا هەمیشە بەمجۆرەی ئەمڕۆکە بووە. واتە سنووری کاری ئافرەت تەنیا لەنێو ماڵ و خێزاندا بووە، بەپێی



ئەم بۆچوونە دابەشکردنی کار لەنێوان ئافرەت و پیاودا لە هەوەڵ رۆژەکانی مێژووی تیرەی بەشەرەوە، کوتومت وەکو ئەم دابەشکردنە باوەی ئەمڕۆکە بووە، کاری پیاو لە دەرێی ماڵە وکاری ئافرەت لەنێو ماڵ و خێزاندایە. هەندێ لە ئافرەتانی لایەنگری ئازادی ئافرەت، گلەیی ئەوە دەکەن کە پیاو لەبڕی کارکردنی لە دەرێی ماڵ، کرێ و هەقدەست وەردەگرێ، بەڵام ئافرەت لەبڕی کارکردنی لە ماڵەوە، چ کرێ و هەقدەستێك وەرناگرێ. بەڵام بێدادییەکە لەمەش هێوەتر دەڕوات، چونکە ئافرەتی پابەندی ماڵ، لەچوارچێوەی حەساری ماڵدا و لە ئاکامی ئەنجامدانی سوکە کاری گەوجانەی بەردەوامی نێوماڵدا دووچاری نەزۆکی ئەقڵی و رۆشنبیرییش دەبێ.ئاشکرایە کاری کۆمەلایەتی جۆرە سەربەخۆییەکی ئابووری بەمرۆڤ دەبەخشێت، لێ مەخابن ئافرەت لەو جۆرە کارە کۆمەلایەتییانە بێبەش کراون و ئەو جۆرە کارانە تەنیا بۆ پیاو تەرخان کراون. شوکردن و خێزان دروست کردن بە چاکترین پیشەی ژنانە حسێب دەکرێ، گەلێ یاسای کۆنەپەرستانەی وەك قەدەغە کردنی لەباربردنی منداڵ و مەنع کردن، بێ گوێدان بەخواستی ژن، ژن ناچار دەکات بەبێ ویستی خۆی ببێ بە خاوەن منداڵ، هەروەها نەبوونی بەخێوگەی منداڵان، ژن ناچار دەکات بەتەنێ ئەرکی گرانی پەروەردەکردنی منداڵ دەستۆ بگرێ.

بەپێی بڕیارەکانی کڵێسا و داکۆکی کاران لە سیستەمی باو، مەسەلەی ماڵ و خێزان بنکەیەکی جاویدانییە و جێی راستەقینەی ژنە،

بۆیە ژنی ژنانە لەسەرێتی لەوێدا خزمەتی مێرد و منداڵی خۆی بکات. بەڵام هەرگیز ئەمە دروست نییە بێین غەریزەی زاوزێ وەکو پرۆسەیەکی سروشتی لەگەڵ مەسەلەی دامەزراندنی خێزان وەکو بنکەیەکی بەشەری بەیەك شت حسێب بکەین، راستە ژنان ئەرکی هەمیشەیی مانی تیرەی بەشەریان لە ئەستۆدا بووە و لە ئەستۆدایە، بەڵام هەرگیز لە هەموو قۆناغێکی بەشەریەتدا بەوە مەحکوم نەبوون کە لە چوارچێوەی بنکەیەکدا بەنێوی خێزانەوە بژین و لە خزمەتی مێرد و خێزان دابن. بەکورتی "خێزانی جاویدانی"(68) خۆی لەخۆیدا هەوڵدانێکە بۆ سەلماندنی دروستی "تیۆری منداڵدان" و سوك تەماشا کردنی ئافرەت.

یەکەمین دابەشکردنی کار لە نێوان ئافرەت و پیاودا، بەپێچەوانەی ئەمڕۆوە، بریتی نەبووە لەوەی کە پیاو کاری دەرێی ماڵ دەستۆ بگرێ و ئافرەت تەنیا کاری ناو ماڵ وەستۆ بگرێ، بەڵکو هەر یەکێك لەم دوو رەگەزە، بەتایبەتی لەکۆمۆنە سەرەتاییەکاندا کاری کۆمەڵایەتی خۆیان ئەنجامداوە. ئەم دابەشکردنی کارە، دابەشەکردنێکی عەمەلی بووە، چونکە



سیستەمی بەرهەمهێنانی هاوبەش، دەقا و دەق لەگەڵ پەروەردە و بەخێو کردنی دەستەجەمی منداڵاندا گونجاو بووە. کیژان لەلایەن ژنانی سەرەوە ئامادە و پەروەردە دەکران تا ئەرکی ئایندەی خۆ فێرببن، کوڕانیش لە تەمەنێکی تایبەتیدا بە پیاوانی کامڵ دەسپێردران تا ئەرکەکانی ئایندەیان فێر بکەن. پەروەردە و بەخێو کردنی منداڵ کارێکی کۆمەڵایەتی بووە و پیاو و ژن بەشێوەی یەکسان بەشدارییان تێدا کردووە. بەڵام لەگەڵ ئاوابوونی ئەستێرەی دەسەڵاتی کۆمەڵگەی داك سەروەری و نەمانی یەکسانی ماف لە نێوان ئافرەت و پیاودا ئیدی ئافرەت لەکارە کۆمەڵایەتییەکان دوور خرایەوە و ئەرکی کارەکرێتی لەنێو چوار دیواری ماڵدا پێسپێردرا، تا لە ئەنجامدا پیاو بەهۆی ئەم جۆرە کار دابەشکردنەوە، دەسەڵاتی تەواوی وەرگرت. مێژوو نووسان ئەوەیان ساغ کردۆتەوە کە لەگەڵ پەیدابوونی ئابوورییەکی تازەی پشت بەستوو بەکشتوکاڵ و ماڵات بەخێوکردندا، جۆرە دابەشکردنێکی تازەی کار هاتە ئاراوە و جێگەی دابەشکردنە کۆنەکەی کاری نێوان هەردوو رەگەزی ئافرەت و پیاوی گرتەوە. بۆ وێنە ماڵات بەخێوکردن لە کشتوکاڵ جیا بووەوە، کان دەرهێنان، بیناکردن، کەشتی سازی، چنینکاری، سواڵەتسازی و گەلێك پیشەی دی لایەنی پسپۆریتیان پەیداکرد. هاوکات لەگەڵ ئەم کار دابەشکردنەی

بواری پیشه جۆراوجۆرەکاندا، زۆر پسپۆریی تازە لە بواری ڕۆشنبیریدا گەشەی کرد، ئیدی لە کەشیشییەوە بیگرە تا دەگاتە شاعیری و زانایی و هونەرمەندی، هاتنە ئاراوە. لەم گۆڕانکاریانەوە ئیدی ڕۆڵی ئافرەت و پیاو بەتەواوەتی گۆڕا و لەگەڵ پەرەسەندنی ئەم جۆرە کار دابەشکردنەدا، بەڕێوەبردنی کارەکانی پتربەلای پیاودا کەوتەوە و لە ئەنجامدا بەتەواوەتی کەوتە دەستی پیاوان. ژنان بەتۆبزی لەچالاکییە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان دوورخرانەوە و خزێنرانە نێو چوار دیواری ماڵەوە و لەگەڵ پەرەسەندنی دەسەڵاتی دەوڵەت و کڵێسادا، ژنان بەوە ڕاهێنران کە ئەوپەڕی سنووری ژیانیان چوار دیواری ماڵە و باشترین ژنیش ئەوانەن کە بێ چ گلە و گازندەیەك خزمەتی مێرد و خێزانی خۆ دەکەن. بەمە پایەی ژن هاتە خوارێ و پایەی پیاو بەرز بووەوە، هەر بەهۆی ئەمەوە ژنان نەك هەر لەکاروباری کۆمەلایەتیدا شوێنی خۆیان لەدەستدا، بەڵکو منداڵ پەروەردەکردنیش کە جاران هاوبەش بوو لە نێو ژن و پیاودا، بوو بەپیشەی بێ چەندوچۆنی ئافرەت.

شتێکی بەڵگە نەویستە، ژنانی چینە ڕەنجبەرەکان، هەمیشە کاریان کردووە لە قۆناغی کشتوکاڵیدا، لە کێڵگەکاندا کاریان کردووە، لەماڵەوە کاری دەستییان ئەنجامداوە، منداڵیان بەخێو کردووە، بەڵام هەموو ئەم کارانەیان لە پێناوی مێرد و خێزاندا



بووە، بەهیچ جۆرێ لەکاری کۆمەڵایەتی کۆمۆنە سەرەتاییە هاوبەشەکان نەچووە، بەشێوەیەکی گشتی بەشداریکردن لەکاری کۆمەلایەتیدا مایەی گەشەکردنی بەدەنی و فیکری بووە، جا مەحروم کردنی ئافرەت لەکاری کۆمەلایەتی و گۆشەگیری و ڕاپەڕاندنی کاری نێو چواردیواری ماڵەوە، بوەتە هۆی سستی بەدەنی و کەم فیکری ژنان.

بەکورتی، دابەشکردنی کار لە نێو هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ هەرگیز، هەمیشە بەمجۆرە نەبووە.

دابەشکردنی کار لەسایەی دەسەڵاتی پیاودا کە ڕاستەوخۆ پەیوەست بووە بەپەیدابوونی کۆمەڵگەی چینایەتی و موڵکایەتی تایبەتی و خێزانی "باب سەروەری" یەوە، بەڵگەی دەستدرێژی پیاوە بۆ سەر مافی ئافرەت، بەتایبەتی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کە کارکردن لە مەزارا و کێڵگە خانەوادەییەکاندا لەبەین چووە و ڕۆڵی خێزان بووە بەڕۆڵی بنکەیەکی ئیستیهلاکی لەسەر دەمی شارنیشیدا.

ڕەتکردنەوەی ئەو ئەفسانە بێ بنج و بناوانەی کە بۆتە هۆی ئەوەی ئافرەت پەیرەوی "تیۆری منداڵدان" و "خێزانی جاویدانی"و.... بکەن، تەنیا لەبەرخاتری ڕاستکردنەوەی هەڵەی چەند زانا و مێژوونووسێك نییە. بەڵکو پتر لەبەر ئەوەیە کە کاریگەرییەکی گەورەی لەبزووتنەوەی ئازادی ئافرەتدا

دەبێت، ئەم هەنجەتەش کە پێکهاتەی بەدەنی ئافرەت هۆی هاتنە خوارەوەی پایەی ئافرەتە لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆدا، خۆی لە خۆیدا، جۆرە پەردەپۆشییەکە بۆ درێژەپێدانی دەسەڵاتی پیاو بەسەر ئافرەتدا. ئەگەر پوچەڵی ئەم هەنجەتە بێتە سەلماندن، ئەوا پێگەی زاڵی پیاو، کە لەسەر بناغەی ئەو جۆرە هەنجەتانە رۆنراوە هەرەس دێنێ. ئەگەر لە باری سەرنجە سروشتییەکەوە بڕوانینە ئافرەت و پیاو، ئەوا هیچ جۆرە بێ تواناییەکی بەدەنی لە ئافرەتدا نییە، ئافرەت لە کۆمۆنە سەرەتاییەکانی بەر لە پەیدا بوونی چینە کۆمەڵایەتییەکاندا هەرگیز بەهۆی زاوزێوە پایەی کۆمەڵایەتی نەهاتۆتە خوارێ. بەڵکو بە پێچەوانەوە، بەهۆی کاری دوو لایەنەی زاوزێ و بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتییەوە ئەوپەڕی رێزی لێنراوە. بۆیە پێگەی کۆمەلایەتی ئافرەت لە کۆمەڵگەدا، بەپێی هەلومەرجی مێژوویی پەیدا بووە و گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەی کە بووە هۆی نەمانی کۆمەڵگەی داك سەروەری هاوبەش، کردییە کارێك کە پایەی ئافرەت بێتە خوارێ. هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆمەڵگەی چینایەتی باب سەروەریدا، ئیدی پێکهاتەی بەدەنی ئافرەت کرا بە هەنجەتێکی ئایدۆلۆژی، بۆ درێژە پێدانی بێبەشکردنی ئافرەت لە ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و هێشتنەوەی لەپایەی کارەکەرێتیدا. ئافرەتان



تەنیا بەدەست نیشانکردنی ئەم مەسەلەیە دەتوانن سەرەداوەکانی ئەو زوڵمەی ئەوڕۆ لێیان دەکرێت، ببەنە سەر بنج و بناوانی سیستەمی سەرمایەداری، تا ئەو کاتەی ئافرەت بەو هەنجەتە گەوج بکرێ، کە گوایە سروشت–نەك کۆمەڵ– فاکتەری پاشکەوتنی ئافرەتە، ئەوا ئێمەی ئافرەت لە بواری ئازادیخوازی خۆماندا، شکست دێنین، لە خۆپیشاندانێکی ئەم دواییانەی ئافرەتاندا، لە ئەمریکا ئەم دروشمە هەڵگیرابوو: "پێکهاتەی بەدەنی، چارەنووسی ئافرەت دیاری ناکات" دەبێ ئەمە ببێ بە دروشمی بزاڤی ئازادیخوازی ئافرەتان.

# ژێدەر:

ا– آیا سرنوشت زن را، ساختمان بدنی او تعیین میکند؟ از ئیفلین رييد.

ژێدەر و پەراوێزەکان:

1. Engels
2. Sexist
3. patraiarchal
4. LobourTheory
5. Seher WoodWashBurn
6. WilliamHowells
7. Kenneth Oaktey
8. V.GoldenChilde



9. بڕوانە گۆڤاری "سانتیفیك ئەمریکەن" سیبتامبەری 1960
10. بڕوانە کتێبی "چ رووداویك لە مێژوودا رووی دا"ل27.
11. AdamsonHoebel
12. بڕوانە کتێبی "مرۆڤ لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا"ل93.
13. بڕوانە کتێبی "پەڕاوێزێکی رەخنەیی لە ئابووری سیاسی"ل279.
14. بڕوانە کتێبی "وەڵامی مەیمونی رووت"ئێڤلین رييد.
15. MarshallSahlins
16. بڕوانە گۆڤاری "سانتفیك ئەمریکەن"ساڵی 960 ل77
17. Uterus Theory,
18. PenisTheory
19. SirSallyZucherman
20. بڕوانە کتێبی "ژیانی کۆمەلایەتی مەیموونەکان و مەیمونانی بێ کلك"ل69
21. RobrtArdery
22. بڕوانە کتێبی "نەسلی ئەفریقیا"ل125
23. RobertBriffault
24. بڕوانە کتێبی "ئەفسانەی سوکی ژن" ئیڤیلین رييد.

25- henryw. Nissen

26. بڕوانە گۆڤاری "سانتیفیك ئەمریكەن" ساڵی 1960.

27. كتێبی "دایكان"ل118

28. GrahamClark

29. بڕوانە كتێبی "لە برایەتییەوە بۆ شارستانی"ل8

30. ElamanR.Service

31. بڕوانە كتێبی "رێكخراوی كۆمەڵگای سەرەتایی"ل39

*Matrilineal

32. Avuculate

33. Morgan

34. Pairingfamilies

35. Malinowski

36. Trobriand

** بڕوانە كتێبی "ژیانی سێكسی كێویان"ل3.

37. Tama

38. بڕوانە كتێبی "ژیانی سێكسی كێویان"ل4

39. Duality

40. Patrilineal

41. SidneyHartland

42. بڕوانە كتێبی "كۆمەڵگای سەرەتایی"ل34

43. Spancer



44. Gillen

45. تیرە خۆماڵییەكانی ئوسترالیای ناوەندی ل591 691

46. بڕوانە كتێبی "دایكان" ل338-339

47. j.lafitau

48. بڕوانە كتێبی "دایكان"ل316

49. AlexanderGold5oIrouois

51. بڕوانە كتێبی "مرۆڤناسی" ل365 Goodpeter

52. Clinton-

53. بڕوانە كتێبی "دایكان" ل316-317

54. RockHill

55. بڕوانە كتێبی "دایكان"ل327

56. KateMillet

57. SexualPoletics

58. بڕوانە كتێبی "سیاسەتی سێكسی"ل46

59. ShulamithFirestone

60. TheDialecticOfSex

61. هەمان سەرچاوە، ل84

62. هەمان سەرچاوە.ل83

63. LucvMair

64. بڕوانە كتێبی "پێشەكییەك بۆ مرۆڤناسی

کۆمەڵایەتی"ل83

65.KathleenAberle

66.MatrilinealKinShip

67.بڕوانە کتێبی "لە خوارێ بۆ سەرێ"ساڵی 1971

68.EternalFamily

## ژیان نامەی نووسەر

حەمە کەریم عارف

- کەرکووکییە و لە ساڵی 1951دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی 1975 کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (170) رۆژنامەی هاوکاری ساڵی 1973 بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی 1976ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك, نووسەری کوردستان, کەلتوور, نووسەری کورد, گوڵانی عەرەبی, ئاڵای ئازادی تا ژمارە 00222, گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی, بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك, نووسەری کوردستان, کەلتوور, رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: 222 بەناوی



گۆڤەند, زنار, سیپان, پاکزاد, محەمەدی حاجی, سیروان عەلی, دیدار هەمەوەندی, هێژا, ح. ع بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.

- جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و رێکخراوێکی سیاسی نەبووە, لە ساڵی 1974 – 1975دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە, لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ, بێ وابەستەگی حیزبی, پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات, چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە, لێ زۆربەی هەرە زۆریان, بە تایبەتی ئەوانە لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاو بوونەتەوە, لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

1- تیرۆژ, کۆ چیرۆك, چاپی یەکەم 1979
2- کۆچی سوور, رۆمان, چاپی یەکەم 1988
3- بەیداخ, چیرۆك, 1988
4- داوەتی کۆچەرییان, کۆ چیرۆك چاپی دووەم 2005
5- لە خۆ بێگانە بوون, کۆمەڵە چیرۆك, چاپی یەکەم (1999) دەزگای گوڵان
6- کوچ سرخ, کۆ چیرۆك, بە فارسی, وەرگێڕان چاپی یەکەم 1987 شاخ
7- نینا, رۆمان, سابت رەحمان, دوو چاپ, شاخ, شار 2002
8- نامۆ, رۆمان, ئەلبێر کامۆ, دوو چاپ, شاخ, شار 2003 دەزگای ئاراس
9- رێبەر, رۆمان, مەهدی حسین, یەك چاپ (شاخ)
10- شکست, رۆمان, ئەلکساندەر فەدایەف, چاپی شاخ (راه کارگر)

11 – هاوماڵەکان, ڕۆمان, ئەحمەد مەحمود, دوو چاپ, شاخ, شار 2000 گوڵان

12– بێناسنامەکان, ڕۆمان, عەزیز نەسین, 3 چاپ شاخ, شار 2003

13– قوربانی, ڕۆمان, هیرب میدۆ, چاپی یەکەم 2004 دەزگای شەفەق

14– دووره وڵات, ڕۆمان ع. ڤاسموف, چاپی یەکەم2000 دەزگای گوڵان

15– ئازادی یا مەرگ, ڕۆمان, کازانتزاکیس, چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران

16– چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی, دوو چاپ, شاخ, شار 2004 کتێبخانەی سۆران هەولێر

17– ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی, چاپی شاخ 1985

18– دلێریی خۆراگرتن, ئەشرەڤ دەهڤانی, چاپی شاخ

19– مەسەلەی کورد لە عێراقدا, عزیز شەریف

20– مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد, ئیحسان نوری پاشا, یەك چاپ

21– خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ, مەسعودی ئەحمەد زادە, چاپی شاخ

22– کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو, د. کوینتەر دیشنەر, چاپی شێیەم 2004 دەزگای ئاراس

23– لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس, نەجەف قولی پسییان

24– گوزارشتی مۆسیقا, د. فۆاد زەکەریا.

25– دەربارەی شیعر و شاعیری, ڕەزا بەراهەنی.

26– ڤنسنت ڤان گوگ, شانۆنامە, باول ئایز لەر

27– بە دوعا شاعیرەکان, شانۆنامە, جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:12)

28– جولەکەکەی ماڵتا, شانۆنامە, مالرۆ.

29– دادپەروەران, شانۆنامە, ئەلبیر کامۆ.

30–بەد حاڵی بوون, شانۆنامە, ئەلبیر کامۆ.

31– چاو بە چاو, شانۆنامە, گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)

32– ریچاردی سێیەم, شانۆنامە, شەکسپیر.

33– گەمەی پاشا و وەزیر, شانۆنامە, عەبدوڵڵائەلبوسێری.



34– کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا, چاپی یەکەم 1998 وەزارەتی ڕۆشنبیری.

35– هونەر و ژیانی کۆمەڵایەتی, پلیخانۆڤ, چاپی یەکەم 2005 دەزگای موکریانی

36– پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت, ئیڤلین ڕیید.

37– لێکدانەوەیەك لە مەڕ نامۆ, لویس ڕیی.

38– منداڵە دارینە, چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.

39– فاشیزم چیی؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان, یەلماز گونای

40– شوانە بچکۆلەکە, چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان

41– زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)

42– لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە.

43– کۆمەڵێك ئەفسانەی جیهانی (23 ئەفسانە)

44– زندە خەون, کۆمەڵە چیرۆکی چیخوف, چاپی یەکەم (2001) دەزگای موکریانی

45– ئەفسانەێن گریکی و ڕۆمانی, چاپی یەکەم (2004) کتێبخانەی سۆران, هەولێر

46– جێ پێ, کۆمەڵێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان:(سادقی هیدایەت, جەلال ئال ئەحمەد, بوزرگی عەلەوی, سادقی چوبەك, مەنسوری یاقوتی)

47– چیرۆکستان, کۆمەڵێك دەق و ڕەخنە, چاپی یەکەم 2005 نووسەرانی کەرکووك

48– چۆنیەتی فێر بوونی زمانی فارسی, چاپی یەکەم (2000) حەمە کەریم عارف

49– گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف

50– پەلکە ڕەنگینە, حەمە کەریم عارف, چاپی یەکەم (2004) وەزارەتی ڕۆشنبیری

51– کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە

52– چزیشفسکی, فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی ڕوس

53– چایکۆ فسکی, ژیان و بەرهەمی.

54– ئیدگار ئالین پۆ, ژیان و بەرهەمی.

55– جاك لەندەن, ژیان و بەرهەمی

56– گوگول, نووسەری ریالیست

57– یەڵماز گونای, ژیان و بەرهەمی

58– سادقی هیدایەت, ژیان و بەرهەمی

59– خافرو غ لە شیعر دەدوێ, ژیان و بەرهەمی

60– رێبازە هونەرییەکانی جیهان

61– ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا, چاپی یەکەم (2004) دەزگای سپیرێز

62– راگەیانـدن لـە پـەراوێزی دەسـەڵاتدا ( بـە شـەریکی) چـاپی یەکـەم (2001) دەزگای گوڵان

63– راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا, حەمە کەریم عارف

64– دیدار و دەق و رەخنە.

65– دیداری چیرۆکڤانی.

66– قوتابخانە ئەدەبییەکان, رەزا سەید حسەینی.

67– ناودارانی ئەدەب, حەمە کەریم عارف

68– هەزار تۆپی شیعری نوێخوازی و چەند باسێکی دی, حەمە کەریم عارف.

69– کـورد لـە سـەدەی نـۆزدە و بیسـت دا, کـریس کۆچـرا, چـاپی یەکـەم 2003 کتێبخانەی سۆران

* لە راپەرینـەوە تـا نهـوو چـالاکانە بەشـداری بزاڤـی ئـەدەبی و رۆشـنبیریی کـوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن, ئامادەیە بە خۆڕایی پێشکەشیان بکات و...



**ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی لقی کەرکووکی یەکێتی نووسەرانی کورد پاش کۆنفرانسی ئازادی بەچا پی گەیاندوون جگە لە گۆڤاری گزنگ کە بەردەوام مانگانە دەردەچێت.**

| | | |
|---|---|---|
| 1– چیرۆکستان | دەق و رەخنە | حەمە کەریم عارف |
| 2– کرکوك والتگهیر العرقی | دیکۆمێنت | و: رەعد بابان |
| 3– مانیفێستەکانی پووچی | هۆزان | مەهدی زریان |
| 4– شیعری هەڵبژاردە بۆ منالْ و گەورە | هۆزان | لەتیف هەڵمەت |
| 5– بەرەو شێت بوون | هۆزان | عومەر سەیدە |
| 6– دڵۆپە | هۆزان | یوسف لەتیف |
| 7– ماچ | کۆمەڵە دەق | بەکر دەروێش |
| 8– چاوبڕکێی سەر زورگەکان | چیرۆك | حەمە سەعید زەنگنە |
| 9– داوەتی کۆچەریان | چیرۆك | حەمە کەریم عارف |
| 10– ناسنامەی دەق | رەخنە و لێکۆڵینەوە | د. فوئاد رەشید |
| 11– شرۆڤەیەك لە بازنەدا | گوتارو رەخنە | سەردار جاف |
| 12– – تەکنیکی گێڕانەوە لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا | لێکۆڵینەوە | شوکریە رەسولْ |
| 13– گەڕانەوە بۆ حەیفا | چیرۆکی وەرگێردراو | ئەحمەد عارف |

| | | |
|---|---|---|
| 26– داستانا لێدانا گازخانا کەرکوك ل سالا 1969 | داستان | وەصفی حسن ردێنی |
| 27– دار زەیتوون | چیرۆك | فەیسەڵ تاهیر هەمەوەندی |
| 28– یاریزانی شەترەنج | رۆمان | و: محەمەد سابیر مەحموود |
| 29– ئەو وشانەی درِ بە تاریکە شەو دەدەن | وتار | لەتیف هەڵمەت |
| 30– یوونس ئەمرە خۆشەویستیی خاك و مرۆ | هۆزان | و: ئەحمەد تاقانە |
| 31– کوردو ڕەگەزی ئاری | لێکۆڵینەوە | مەلا جەمیل رۆژبەیانی |
| 32– هجره الگائر الازرق | شعر | عباس عسکر |
| 33– دەروازەیەکی مێژوویی بۆ مافەکانی مرۆڤ | لێکۆڵینەوە | کامەران تاهیر |
| 34– ئەشکەوتی خوێن | رۆمان | سالار ئیسماعیل سەمین |
| 35– مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدەبی–<br>رۆشنبیری | ئەدەبیات و رۆشنبیری | حەمە کەریم عارف |
| 36– منداڵێك بووم لە کوردستان | چیرۆك | و: عومەر عەلی شەریف |
| 37– خۆشنووسانی کورد | خۆشنووسی | عەبدولستار جەباری |
| 38– بەرسیلە عیشقێ بۆ خودا | شیعر | ئاوێزان نووری |
| 39– مانگ | شیعر | و: هیمەت کاکەیی |
| 40– چەمك و ستاتیکای شوێن لەئەدەبدا | لێکۆڵینەوە | سەباح ئیسماعیل |



| | | |
|---|---|---|
| 55– کوردو چەند بابەتێکی مێزووی | لێکۆڵێنەوە | **هاشم عاسی کاکەیی** |
| 56– کەرکوك : شاری قەلاّو ئاگرو خوێن | لێکۆڵینەوە | عەلی مەحمود محەمەد |
| 57- گەشتێك لەنێوان مانگو دەریادا | شانۆگەری | د . عەبدولکەریم حاجی محەمەد |
| 58- شەوە خوێناویەکەی ژوورسەری دایکم | کورتە چیرۆك | محەمەد حسێن |
| 59- ئە ثیري | لێکۆڵینەوە | د. ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید |
| 60- مقام و مۆزیکی فۆلکلۆری کوردی سەلاح داودە وەك نموونەیەك | لێکۆڵینەوە | هەردەوێڵ کەکەیی |
| 61- رۆبن هوود | چیرۆك | و: زنار محمد |
| 62– دیوارێك وسێ نیگار | هۆنراوە | عباس عەسکەر |
| 63- جەنگ و نێوانەکان | کۆمەڵە وتار | سمکۆ محەمەد |
| 64– بەرتەوازەکانی ئێرە و ئەوێکانی ڕەوان | رۆمان | عبدولا سەراج |
| 65– گۆڵە مۆرەکان | چیرۆك یۆمنالاّن | و/ عبدولا سلیمان (مەشخەڵ ) |
| 66– تەمەنی مرۆڤ | چیرۆك | و/ سەلاّح سالّح مەجید |
| 67– پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت | لێکۆڵینەوە | و/ حمە کەریم عارف |

